# ئیسلام و دەوڵەتداریی

## تەوەری چوارەم

## نا مسوڵمانان لە کۆمەڵگا و دەوڵـەتی ئـیـسـلامیی دا






علي باپير | التفسير


ISLAM AND THE STATE


ئیسلام و دەوڵەتداریی
علی باپیر


4

التفسير



# ئیسلام و دەوڵەتداریی

بەرگی چوارەم

**نووسینی**
عەلی باپیر
**بڵاوکردنەوەی**
نوسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن
**نەخشەسازی ناوەوە**
نەوزاد شەهاوانی
**خەت**
نەوزاد کۆیی
**بەرگ**
شركة الإثراء للحلول التقنية و الإعلامية
**قەبارەی کتێب**
١٧×٢٤- ( ١٩٦ ) لاپەڕە
**نۆرە و ساڵی چاپ**
یەکەم ١٤٣٧ ك - ٢٠١٦ ز
**تیراژ**
١٥٠٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی
سپاردنی ( ٢٦١٢ ) ی ساڵی ٢٠١٣ ی پێدراوە



**نوسینگەی تەفسیر**
بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن
هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر هوتێلی شیرین پالاس
+964 750 818 08 66
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com
/TafseerOffice

## پێشکەش بێ

بەهەموو ئەوانەی هێندە لە ئیسلام تێگەیشتوون، کە دڵنیابن بەبێ هەبوونی دەستەڵات و قەوارەیەکی سیاسیی، ناگونجێ وەك بەرنامەی گشتگیری ژیان و گوزەرانی تاك و کۆمەڵ جێ بەجێ بکرێ و، هەتا باڵا دەست نەکرێ، بۆی ناڵوێ، وەك درەختێکی پڕ سێبەری بەپیت و فەڕ، سەرجەم پێکهاتەکانی کۆمەڵگا لەبن سێبەری خۆی بگرێ و، بەرو میوەی تەبایی و ئازادیی و یەکسانیی و دادگەریی و، بەختەوەریی دنیاو سەرفرازیی قیامەتیان بۆ بگرێ.

# پێشەکی

إِنَّ الحَمْدَ للهِ، نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَلاَ مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلْ فَلاَ هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، **أَمَّا بَعْد:**

**خوێنەری سەنگین و شیرین!**

ئەم بەرگی چوارەمەی کتێبی: [ئیسلام و دەوڵەتداریی][1] تەوەری چوارەم و کۆتایی بابەتی فراوانی ئیسلام و دەوڵەتداریی و حوکمڕانیی گرتۆتە خۆی، کە بریتیە لە: [نامسوڵمانان لە کۆمەڵگا و دەوڵەتی ئیسلامیی دا]، ئنجا لە سۆنگەی ئەوەوە کە ئێمە لە [ڕێ خۆشکردن] دا باسی نێوەڕۆك و بابەتەکانی ئەم تەوەرەمان کردوە، بۆیە بەپێویستی نازانم لێرە دووبارەی بکەمەوە، بەڵام لەبارەی گرنگیی و هەستیاریی بابەتی: چۆنیەتی مامەڵە لەگەڵ کرانی نامسلۆمانان لە کۆمەڵگا و دەوڵەتی ئیسلامیی دا، بەکورتیی دەڵێم:

لە واقیعی ئێستای مسوڵمانان دا، لە سۆنگەی ئەوەوە کە ستەم و داپڵۆسینێکی زۆری ئەهلی کوفر کەوتۆتە سەر مسوڵمانان و بەزۆر شێوە ستەمیان لێ دەکرێ و، بوون و کەرامەت و مافەکانیان پێشێل دەکرین، زۆرێك

---

(١) دیارە بۆ ئەم بەرگی چوارەمەش هەر ئەو برا دڵسۆزانەی بۆ سێ بەرگی پێشوو هاوکاربوون، دەست بەکاربوون: کاك یعقوب کاکل و، کاك مەلا بلال قەڵادزەیی و، کاك هەرێم هادی، خوا باشترین پاداشتیان بداتەوە.

لە هەڵوێستەكانیان لەبەرانبەر نامسوڵمانان دا بەگشتی، حاڵەتی كاردانەوە (ردّ فعل) و مۆركی تێپەڕاندن (طابع الإفراط)ی بەخۆوە گرتوە و، سەرەنجام ئیسلامێك كە خوای كاربەجێ ناردوویەتی: سایە و سێبەری مرۆڤایەتیی بێت و، مایەی ڕەحمەت و بەخششی خوا بێ، بەپێچەوانەوە خراوەتە بەرچاو و، دەوڵەتێكی ئیسلامییش كە بناغەكەی ئیمانیی و چوارچێوەكەی ئینسانیی یە، واپێشاندراوە كە نەك هەر جێگای نامسوڵمانانی تێدا تێدا نابێتەوە، بەڵكو بەزەحمەت جێی هەموو موسڵمانانیشی تێدا دەبێتەوە!!

هەر بۆیەش جێی خۆیەتی و زۆریش پێویستە، كە ئەو بابەتە لە تەوەرێكی سەربەخۆدا بتوێژرێتەوە و، تیشكێكی باشی بخرێتەسەر.

ئنجا دیارە من بۆ نووسینی ئەم بابەتەش، وەك سەرجەم باس و بابەتەكانی: (ئیسلام و دەوڵەتداریی) سوودم لەسەرچاوە گەلێكی زۆری كۆن و هاوچەرخ وەرگرتوە و، لێیان بەهرەمەند بووم، كە لەپەڕاوێزدا ئاماژەیان پێدەكەم، بەڵام بەڕاستیی تەنیا قورئان و سوننەتم كردوونە بناغەی ئەم بابەتە و سەنگی مەحەكی ئەو قسە و باس و ڕووداوانەی كە لەوبارەوە دەیانهێنمەوە و، هەر قسە و هەڵوێستێك هی هەر كەسێك بێ - لەزانا و پێشەوایانی ئیسلام - لە تەرازوو و مەحەكی قورئان و سوننەت دەرنەچێ، لەسەر ئیسلامیی حیساب ناكەم و، وەك بەڵگەیەكی شەرعیی مامەڵەی لەگەڵ ناكەم.

گومانیشی تێدانیە كە هەموو ئەوەی زانا و شارەزایانی بواری حوكم و سیاسەت لەژێر ناوونیشانی: [سیاسەتی شەرعیی] دا هێناویانە، بە لەبەرچاوگرتنی ئەو واقیعە سیاسییەی خۆیان بووە كە تێیدا ژیاون، بۆیە بێگومان واقیعێكی دیكەی سیاسی جیاواز لەوەی ئەوان، بیروڕاو بۆچوونی دیكە پەیدا دەكات و هەر لێرەشەوەیە كە زانایان گوتوویانە: (لا ینكر تَغَيُّرُ الأحكام بتغيُّر الأزمان والأحوال) واتە: نكوولّیی ناكرێ لە گۆڕانی یاساكان، بەپێی گۆڕانی ڕۆژگار و هەل و مەرجەكان.

هیواداریشم هەموو لایەكمان بەردەوام لەهەوڵی قووڵبوونەوە و وردبوونەوەی زیاتر دابین لە قورئان و سوننەت و، عەقڵ و دڵیشمان هێندە فراوان بن، كە

شایستەی لێتێگەیشتن و گەیاندنی ئایین و بەرنامەی تێروتەواو و فراوان و گشتگیری خوای پەروەردگار بن و، بەهۆی بیرتەسکیی و دڵ بچووکیی خۆمانەوە، ئیسلامێك کە خوا (عُسْر) و (حرج)ی لێ لابردوە، بە قورس و سەغڵەتکەر (عسیر) و (مُحْرِجْ) پیشانی نەدەین!

٥ جمادی الأولی ١٤٣٧ك

١٤ شوباطی ٢٠١٦ز

هەولێر

# ناوونیشانەكانی بەشەكانی ئەم تەوەرە

١- تێڕوانینی ئیسلام بۆ ئینسان و ژیان و جیهان.

٢- ئەزموونی دەوڵەتی پێغەمبەر لەبواری هەڵس و كەوت كردن لەگەڵ هاووڵاتییانی نامسوڵمان دا.

٣- ئەزموونی دەوڵەتی ئیسلامیی دوای پێغەمبەر و خەلیفە ڕاشیدەكان لە بواری هەڵس و كەوت كردن لەگەڵ هاووڵاتییانی نامسوڵمان دا.

٤- دەوڵەتێكی ئیسلامیی دەبێ چۆن مامەڵە لەگەڵ هاووڵاتییانی نامسوڵمان دا بكات؟

٥- دروستە هاووڵاتیانی نامسوڵمان لە كۆمەڵگا و دەوڵەتی ئیسلامیی دا، ئەركە گشتییەكان (الوظائف العامة) یان پێ بسپێررێن.

٦- توێژینەوەیەك لەبارەی سەرانەوە، سەرانە(جزیە) چییە و چۆن و كەی و لەكێ وەردەگیرێ؟!

٧- هەموو مرۆڤێكی سەلامەت و بێ زیان، بۆی هەیە ببێتە هاووڵاتیی كۆمەڵگا و دەوڵەتی ئیسلامیی.

٨- مافەكانی نامسوڵمانان اە دەوڵەتی ئیسلامیی دا.

# ڕێ خۆشکردن

**خوێنەری بەڕێز!**

ئێمە لە باسەکانی ڕابردوودا چەند جارێك ئاماژەمان پێدا، کە خوا پشتیوان بێت، تەوەرێك تەرخان دەکەین بۆ توێژینەوەی ئەو بابەتە کە ئایا: لە دەوڵەت و کۆمەڵگەیەکی ئیسلامییدا، خەڵکی نامسوڵمان بەمانای فراوانی وشەی (نامسوڵمان) بە هەموو پێکهاتەکانیانەوە، چۆن تەماشا دەکرێن و، چۆن مامەڵەیان لەگەڵ دا دەکرێ، وە پێگە و جێگا و ڕێگایان چۆن دەبێت؟!

دیارە ئێمە لە میانەی توێژینەوەی بابەتەکانی ڕابردوو دا، کەم و زۆر ئاماژەمان بەوە کردوە، کە نامسوڵمانان پێگەو جێگا و ڕێگایان چۆنە؟ وە چ جۆرە هەڵسوکەوت و مامەڵەیەکیان لەگەڵ دا دەکرێ؟ بەڵام لەبەر ئەوەی ئەم بابەتە زۆر هەستیارە، وە بەتایبەتی لەم ڕۆژگارەدا زۆر ئیشکال دەورووژێنرێن لەو چوارچێوەیەدا، بۆیە بە پێویستم زانی ئەم تەوەرەی بۆ تەرخان بکەین.

**سەرەتاش دەڵێم:** دەوڵەتی ئیسلامیی دەوڵەتێکی ئیمانییە لە ڕووی بناغەوە، وە ئینسانییە لە ڕووی چوارچێوەوە، واتە: بناغەیەك کە دەوڵەتی ئیسلامیی لەسەر بنیات دەنرێ، بریتیە لە ئیمان، وە پێکهاتەی سەرەکیی دەوڵەتێکی ئیسلامیی مسوڵمانانن و ئەوانیش بە ئیمان بەیەکەوە گرێ دەدرێن، وەك خوا (سُبحانَهُ وَتَعالَى) دەفەرمویَ:

﴿ وَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ لَوْ أَنفَقْتَ مَا فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا مَّا أَلَّفْتَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ وَلَٰكِنَّ اللَّهَ أَلَّفَ بَيْنَهُمْ ﴾ الأنفال -٦٣-.

بەڵێ پێکهاتەی سەرەکیی کۆمەڵگا و دەوڵەتێکی ئیسلامیی، مسوڵمانانن کە بە ئیمانەوە، دڵەکانیان پێکەوە جۆش دراون، بەڵام ئایا کۆمەڵگا و دەوڵەتێکی ئیسلامیی لەسەر مسوڵمانان و، ئیمانداران قۆرخ دەکرێ و تەنیا تایبەتە بەوانەوە؟ یاخود کراوەیە بە ڕووی هەموو مرۆڤەکان دا ؟، لە ڕاستییدا دەوڵەتی ئیسلامیی بە ڕووی مرۆڤەکان دا کراوەیە، بۆیەش دەڵێین: دەوڵەتی ئیسلامیی لە ڕووی بناغەوە ئیمانییە و لە ڕووی چوارچێوەوە، ئینسانییە و بە ڕووی هەموو مرۆڤەکان دا کراوەیە، ئنجا ئێمە خوا پشتیوان بێ لەم تەوەرەدا ئەو ڕاستییە بە بەڵگەی بەهێز و ئیقناعکەر، ئیسپات دەکەین و دەسەلمێنین.

**وە ئێمە ئەم تەوەرە لە هەشت (٨) بەشی سەرەکییدا دەخەینە ڕوو:**

**بەشی یەکەم:** تێڕوانینی ئیسلام بۆ ئینسان و ژیان، واتە: لە بڕگەی یەکەم دا باسی بوونناسیی ئیسلامیی دەکەین، تێڕوانینی ئیسلام بۆ ئینسان و ژیان و جیهان و دەوروبەر.

**وە لە بەشی دووەم دا:** باسی ئەزموونی دەوڵەتی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەکەین لەگەڵ نامسوڵمانان دا، واتە: هاووڵاتییانی نامسوڵمان.

**وە لە بەشی سێیەم دا:** باسی ئەزموونی دەوڵەتی ئیسلامیی دەکەین لە دوای پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و چوار جێنشینە ڕاشیدەکانی، لە بواری هەڵسوکەوت لەگەڵ هاووڵاتییانی نامسوڵمان دا.

**وە لە بەشی چوارەم دا:** باسی ئەوە دەکەین کە دەوڵەتێکی ئیسلامیی لەم ڕۆژگارەدا دەبێت چۆن مامەڵە لەگەڵ هاووڵاتییانی نامسوڵمان دا بکات؟

**وە لە بەشی پێنجەم دا:** باسی ئەوە دەکەین کە دروستە هاووڵاتییانی نامسوڵمان لە کۆمەڵگا و دەوڵەتی ئیسلامیدا ئەرکە گشتییەکانیان پێ بسپێردرێن، مەگەر ئەوەی بە دەقێکی شەرعیی تایبەتکرابێت بە مسوڵمانانەوە.

**وە لە بەشی شەشەم دا:** توێژینەوەیەك لە بارەی سەرانە (جزیه )وە دەکەین، کە ئایا چییە و چۆن و کەی و لە کێ وەردەگیرێ ؟

**وە لە بەشی حەوتەم دا:** [ هەموو مرۆڤێکی سەلامەت و بێ زیان، بۆی هەیە ببێتە هاووڵاتیی کۆمەڵگا و دەوڵەتی ئیسلامیی]، ئەو ناوونیشانە دەتوێژینەوە.

**وە لەبەشی هەشتەمیش دا:** سەرژمێرێکی خێرای مافەکانی نامسوڵمانان لەدەوڵەتی ئیلامیی دا، دەکەین.

شایانی باسیشە لە ڕیزکردنی ئەو هەشت بەشەدا ڕێزبەندیی مەنتیقیی و پلەپلەیی مان ڕەچاوکردوە و، بەسەرنجدانێکی وردیش ئەو ڕیزبەندیی و پلەپلەیی (تدرّج)ە زۆر جوان دیارە.

لەم بەشەی یەکەم دا باسی بوونناسیی ئیسلامیی دەکەین، تێڕوانینی ئیسلام بۆ ئینسان و ژیان و جیهان و دەوروبەر.

**بــەڕێــزان!**

ئەم بەشە پێویستە باش سەرنج بدرێ، چونکە بناغەی گشت بەشەکانی دیکەیە و، هەرکەسێك لێرەوە بەرچاوی ڕوون بێت، تێدەگات کە دەبێ لە دەوڵەتێکی ئیسلامییدا و لەکۆمەڵگایەکی ئیسلامییدا، چۆن مامەڵە لەگەڵ سەرجەم ئینسانەکان دا بکرێ، بەبێ لەبەرچاوگرتنی لایەنی فیکریی و عەقیدەیی دینییان؟!

**ئنجا ئێمە لە حەوت خاڵ دا باسی (بووننـاسیی ئیسلام) واتە: تێڕوانینی ئیسلام بۆ: ئینسان و ژیان و جیهان دەکەین:**

**یەکەم: ئاسمانەکان و زەوی و هەرچی تێیاندایە و لە نێوانیان دایە، خوا (سُبحانَهُ وَتَعالی) بەحەق و بۆ کاتێکی دیاریی کراو دروستی کردوون، وە تەنیا خوا (سُبحانَهُ وَتَعالی) بەدیهێنەر و پەروەردگار و خاوەنی ڕاستەقینەی هەموو شتێکە:**

ئەمە ڕاستییەکە کە بووننـاسیی ئیسلامیی و تێڕوانینی ئیسلامیی بۆ ئینسان و ژیان و جیهان، لەسەری بنیات نراوە و، ئەمیش لە چەندان دەقی قورئان دا بەرجەستەیە، بۆ نموونە:

١- خوا (سُبحانَهُ وَتَعالی) لە سووڕەتی: الروم - ٨ - دا دەفەرموێ:

﴿ أَوَلَمْ يَتَفَكَّرُوا فِي أَنفُسِهِم ۗ مَّا خَلَقَ اللَّهُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا إِلَّا بِالْحَقِّ وَأَجَلٍ مُّسَمًّى ۗ وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ النَّاسِ بِلِقَاءِ رَبِّهِمْ لَكَافِرُونَ ﴿٨﴾ ﴾.

واتە: ئایا لەبەر خۆیانەوە بیریان نەکردۆتەوە: کە خوا ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی کە دەکەوێتە نێوانیانەوە، بەحەق و بۆ کاتێکی دیاریی کراو نەبێت دروستی نەکردوون، وە زۆرێك لە خەڵکی بێ بڕوان بە دیداری پەروەردگاریان.

کەواتە: ئەم بوون (وجود)ە کە دەیبینین و ئەوەیش کە نایبینین، بەحەق دروستی کراوە بۆ کاتێکی دیاریی کراو وەدیهێنراوە.

٢- وە لە سوورەتی الزمر-٦٢-دا خوا (سُبحانهُ وَتَعالى) فەرموویەتی:

﴿ ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَيۡءٖۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ وَكِيلٞ ٦٢ ﴾

واتە: خوا بە دیهێنەری هەموو شتێکە و بەسەر هەموو شتێکەوە چاودێرە و مشورگێڕی هەموو شتێکە.

٣- وە لە سوورەتی الرعد -١٦ - دا دەفەرموێ:

﴿ قُلۡ مَن رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ قُلِ ٱللَّهُۚ ﴾

واتە: بڵێ کێ پەروەردگاری ئاسمانەکانە؟ بڵێ خوا. کەواتە: تەنیا خوا (سُبحانهُ وَتَعالى) پەروەردگار و بەدیهێنەر و مشورگێڕی هەموو بوونەوەرە، وە بە حەقیش ئەو بوونە هێنراوەتە دی و بۆ کاتێکی دیاریی کراویش.



**دووەم: ئینسان جێنشینی خوایە لەسەر زەوی و، خوا ( سُبحانهُ وَتَعالى) ئەمانەتی خۆی پێ سپاردوە و، ڕێزی لێ گرتوە و، هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە بۆی مەیسەر کردوە و، تاقی دەکاتەوە و، لە دوا ڕۆژدا ئەنجامەکەی وەردەگرێتەوە:**

ئەمەش ڕاستییەکی دیکەیە کە خوا لە چەندان ئایەتی قورئان دا ڕایگەیاندوە، بۆ وێنە:

١- خوا دەفەرموێ:

﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّى جَاعِلٌ فِى ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً..﴾ البقرة -٣٠-

واتە: وە یادبکەوە کاتێك کە خوا بە فریشتەکانی فەرموو: من جێنشینێك لەسەر زەوی دادەنێم. ئەو جێنشینەش ئادەمە (علیه السلام) وە ئادەمیش بابی مرۆڤایەتییە.

وە لە ئایەتی دیکەش دا هاتوە کە خوای پەروەردگار ڕوو لەهەموو مرۆڤەکان دەکات و دەفەرموێ:

﴿هُوَ ٱلَّذِى جَعَلَكُمْ خَلَٰٓئِفَ فِى ٱلْأَرْضِ﴾ فاطر -٣٩-.

واتە: (خوا) ئەو کەسەیە کە ئێوەی کردوە بە جێنشین لەسەر زەوی. واتە: هەموو مرۆڤەکان جێنشینی خوان لەسەر زەوی.

٢- وە لە سوورەتی (الأحزاب) -٧٢-دا دەفەرموێ:

﴿ إِنَّا عَرَضْنَا ٱلْأَمَانَةَ عَلَى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱلْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا ٱلْإِنسَٰنُ إِنَّهُۥ كَانَ ظَلُومًا جَهُولًا ﴿٧٢﴾ ﴾

واتە: بێگومان ئێمە سپاردەی خۆمانمان ڕانواند لەسەر ئاسمانەکان و زەوی و چیایەکان، کەچی ئامادە نەبوون هەڵیبگرن و لێی ترسان، بەڵام ئینسان هەڵیگرت، ئینسانیش زۆر ستەمکار و زۆر نەفامە.

کەواتە: ئینسان هەڵگری ئەمانەتی خوایە، ئەمانەتێك کە ئاسمانەکان، بەو پان و پۆڕییەوە، وە زەوی، بەو هەموو شتە سەرسوورهێنەرانەوە کە تێیدان، وە چیاکانیش، بەو سەختییەیانەوە، نەیانتوانیوە هەڵیبگرن، بەڵام ئەو توانیویەتی هەڵگری ئەو سپاردەیە بێ، کەواتە: ئینسان لە ڕوانگەی ئیسلامەوە، جێنشینی خوایە و هەڵگری ئەمانەتی خوایە.

٣- وە لە سوورەتی (الإسراء) -٧٠- دا دەفەرمویٚ:

﴿ وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِيٓ ءَادَمَ وَحَمَلْنَٰهُمْ فِي ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ وَرَزَقْنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَفَضَّلْنَٰهُمْ عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلًا ﴿٧٠﴾ ﴾.

واتە: وە بێگومان ڕێزمان لەوەچەی ئادەم گرتوە و، لە وشکانیی و دەریادا هەڵمانگرتوون، وە لە بژێوە بەتام و خۆشەکان پێمان داون، وە بەسەر زۆر لەدروستکراوەکانمان دا بەرزمان کردوونەتەوە، بەرزکردنەوەیەکی دیار و بەرچاو.

کەواتە: وەچەی ئادەم بەگشتی بەهەموو نەتەوەکان و ڕەنگەکان و، بەهەموو جۆرە فیکر و بەرنامەکانیانەوە، وەچەی ئادەم، وەك وەچەی ئادەم، لەلایەن خواوە ڕێزلێگیراون، بۆیەش دەڵێین: ڕێزلێگرتنەکە بۆ هەموو ئینسانەکانە و، چاوپۆشیی لەوە کراوە داخۆ هەڵگری چ فیکرە و ئایین و عەقیدەیەکن، چونکە خوا فەرموویەتی: (....وَحَمَلْنَٰهُمْ فِي ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ..) وە لە وشکانیی و لە دەریادا هەڵمانگرتوون، واتە: هۆکار و ئامرازی وامان بۆ ڕەخساندوون کە لە وشکانیی و لە دەریاو لەهەوادا پێیان بڕۆن، وە فەرموویەتی: (....وَرَزَقْنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ ...)، وە لە بژێوە بەتامەکان بەشمان داون، هەروەها فەرموویەتی: (وَفَضَّلْنَٰهُمْ عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلًا ) یانی: ئەو سیفەت و ئیمتیازانەی کەلە ئینسان دا هەن، وەك ئینسان، لە هیچکام لە دروستکراوەکانی دیکەدا نین، هەڵبەتە بۆیەش ئینسان بەکەڵکی ئەوەهاتوە کە جێنشینی خوا بێ، وە هەڵگری ئەمانەتی خوا بێ، وە لە لایەن خواوە ڕێز و حورمەتێکی تایبەتی لێبنرێ.

دیارە سەرجەم ئەو شتانەش تایبەت نین بە مسوڵمانانەوە و، هەموو بەشەر تێیان دا بەشدارن.

٤- وە لە سوورەتی (الجاثية) -١٣- دا فەرموویەتی:

﴿ وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا مِّنْهُۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ ﴿١٣﴾ ﴾.

واتە: وە هەرچی لەئاسمانەکان و زەویدا هەیە، تێکڕای بۆ ئێوە مەیسەر کردوون (بۆی ڕام و دەستەمۆ کردوون) بێگومان لەوەدا نیشانە هەن، بۆ کەسانێك کە تێبفکرن و بیر بکەنەوە.

کەواتە: ئینسان هەموو بوون (وجود)ی بۆ ڕام و دەستەمۆ کراوە.

٥- وە لە سوورەتی (هود) -٧-دا دەفەرمویَ:

﴿ وَهُوَ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٖ وَكَانَ عَرْشُهُۥ عَلَى ٱلْمَآءِ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلٗاۗ وَلَئِن قُلْتَ إِنَّكُم مَّبْعُوثُونَ مِنۢ بَعْدِ ٱلْمَوْتِ لَيَقُولَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٞ مُّبِينٞ ﴿٧﴾ ﴾.

(ئێمە ئەم ئایەتەمان لە کتێبی: [تەوژمی ئیسلامیی و عەلمانیی و خاڵە هاوبەش و جیاوازەکانیان] دا کردوە بە بناغەی لێکۆڵینەوە دەربارەی بووناسیی ئیسلامیی بەتەفصیڵ لەوێدا تەفسیرمان کردوە) واتە: خوا ئەو زاتەیە کە ئاسمانەکان و زەوی لە شەش ڕۆژان دا [واتە: بەشەش قۆناغ] دروستکردوون، وە لەو کاتەدا بارەگای خوا لەسەر ئاو بوو، تاکو تاقیتان بکاتەوە، کامەتان کردەوەی باشترە، وە ئەگەر تۆ بڵێی: ئێوە لە دوای مردن زیندوو دەکرێنەوە، ئەوانەی بێ بڕوان، دەڵێن: ئەوە جادوویەکی ئاشکرایە.

کەواتە: هەموو ئەم بوونەوەرە، ئەوەی کە دەیبینین و ئەوەی کە نایبینین، بۆیە دروستکراوە کە وەك هۆڵێك بێ و ئینسانی تێدا تاقی بکرێتەوە، وە ئینسانیش لە دوای مردن لێی دەپرسرێتەوە و سزا و پاداشت ڕووی تێدەکات و لێپرسینەوەی لەگەڵ دا دەکرێ.

**سێیەم: خوا ( سُبحانهُ وَتَعالى) سەرجەم مرۆڤایەتیی لە دایك و باپێك وەدیهێناون، وە بەمەبەستی هاوکاریی و ئاشنایيان پێکەوە، گێڕاونی بەچەند گەل و تیرەیەك وە بەڕێزترینیان لە لای خوا پارێزکارتریانە:**

وەك خوا لەسوورەتی: (الحُجُرات) ئایەتی (١٣)دا دەفەرمویٚ:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن ذَكَرٖ وَأُنثَىٰ وَجَعَلۡنَٰكُمۡ شُعُوبٗا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْۚ إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٞ ١٣ ﴾.

واتە: ئەی خەڵکینە! ئێوەمان لە نێرو مێیەك دروستکردوە و گێڕاومانن بەچەند گەل و تیرەیەك، تاکو یەکدی بناسن (پێك ئاشنا بن و پێکەوە هاوکار بن) وە بەڕێزترتان لە لای خوا پارێزکارترتانە بێگومان خوا زانای شارەزایە.

کەواتە: مرۆڤایەتیی هەمووی لەدایك و باپێکەوە هاتوە، بۆیە هیچ کەس پلەو ئیمتیازی بەسەر هیچ کەس دا نیە، وە هیچ کەس بۆی نیە بە هیچ عینوانێك خۆی لەوی دیکە بەبەرزتر بزانێت.

چوارەم: خوا ( سُبحانهُ وَتَعالى) پێغەمبەرانی خۆی ( علیهم السلام ) بە کتێب و بەرنامەکانیەوە بۆ مرۆڤایەتیی ناردوون، تاکو یەکیان بخەن و کێشەو گرفتەکانیان چارەسەر بکەن، وە دادگەرییان لە نێوان دا بەرپا بکەن:

**ئەمیش ڕاستییەکە لە چەندان ئایەتی قورئان دا دروەشێنراوەتەوە. بۆ وێنە:**

١- ﴿ كَانَ ٱلنَّاسُ أُمَّةً وَٰحِدَةً فَبَعَثَ ٱللَّهُ ٱلنَّبِيِّـۧنَ مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ وَأَنزَلَ مَعَهُمُ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ لِيَحْكُمَ بَيْنَ ٱلنَّاسِ فِيمَا ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِ ۚ وَمَا ٱخْتَلَفَ فِيهِ ﴾ البقرة -٢١٣-.

واتە: خەڵك یەك كۆمەڵ بوون، خوا پێغەمبەرانی ناردن تاكو موژدەدەر و ترسێنەر بن، وە كتێبی بەحەق لەگەڵ دا ناردن، تاكو لە نێوان خەڵك دا دادوەریی بكات، لەو شتانەدا كە تێیاندا كەوتوونەتە ڕاجیاییەوە.

كەواتە: پێغەمبەران هاتوون بە كتێب و بە بەرنامەكانی خواوە، تاكو كێشەو گرفتەكانی خەڵك چارەسەر بكەن.

٢- هەروەها خوا فەرموویەتی:

﴿ لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِٱلْبَيِّنَٰتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْمِيزَانَ لِيَقُومَ ٱلنَّاسُ بِٱلْقِسْطِ ﴾ الحديد -٢٥-.

واتە: بێگومان پێغەمبەرانمان بە بەڵگە ئاشكرایەكانەوە ناردوون و كتێب و تەرازووشمان لەگەڵ ناردوونەتەخوار تاكوخەڵك بەدادگەریی بەڕێوە بچن....

كەواتە: پێغەمبەران هەموویان هاتوون كە دادگەریی لەنێو مرۆڤایەتییدا بچەسپێنن.

**پێنجەم: ویستی خوا وابووە کە مرۆڤەکان دابەش بن بۆ کافر و مسوڵمان، وەخراپەکار و چاکەکار، ئەگەرنا ئەگەر خوا ویستبای هەموویان ئیماندار و چاکەکاربان، وادەبوون، بەڵام خوا مرۆڤی ئازاد کردوە و سەرپشك کردوە کە بۆ خۆی ئیمان یاخود کوفر هەڵبژێرێ:**

**ئەم ڕاستییەش دیسان لەچەندان ئایەتی قورئان دا بەرجەستە کراوە، بۆ وێنە:**

١- خوا دەفەرموێ:

﴿ هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَكُمْ فَمِنكُمْ كَافِرٌ وَمِنكُم مُّؤْمِنٌ ۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٢﴾ ﴾ التغابن -٢-.

واتە: خوا ئێوەی دروست کردوە، هەتانە کافرە و هەتانە ئیماندارە، وە خوا بینەری ئەوەیە کە دەیکەن (هەرچی دەیکەن خوا دەیبینێت)، کەواتە: ویستی خوا وابووە کە مرۆڤەکان دابەش بن بۆ ئیماندار و بێ ئیمان، وە مسوڵمان و نامسوڵمان.

٢- وە خوا لە سووڕەتی (یونس) -٩٩- دا فەرموویەتی:

﴿ وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ لَءَامَنَ مَن فِى ٱلْأَرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعًا ۚ أَفَأَنتَ تُكْرِهُ ٱلنَّاسَ حَتَّىٰ يَكُونُوا۟ مُؤْمِنِينَ ﴿٩٩﴾ ﴾

واتە: ئەگەر پەروەردگارت ویستبای، تێکڕای ئەوانەی کە لەسەر زەمینن ئیمانیان دەهێنا، ئایا تۆ زۆر لە خەڵك دەکەی ئیمان بێنن [زۆریان لێدەکەی تاکو بیانکەیە بڕوادار]؟!، واتە: ئەی موحومەد! (صلى الله عليه وسلم) پەروەردگارت نەیویستوە زۆر لە مرۆڤەکان بکات و بەزۆر بیانکاتە ئیماندار، کەواتە: تۆش بۆت نیە زۆریان لێ بکەی، وە بەتەئکید هیچ کەسێکیش بە زۆر ناکرێتە ئیماندار - وەك دوایی باسی دەکەین - بەڵکو کە زۆرت لێکرد، لە کوفری ئاشکراوە دەیگوازیەوە بۆ کوفری پەنهان، لە کافرەوە دەیکەی بە مونافیق، واتە: خراپتر لە کافر!!.

٣- وە لە سوورەتی (هود) -١١٨ و ١١٩ دا خوا دەفەرموێ:

﴿وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ لَجَعَلَ ٱلنَّاسَ أُمَّةً وَٰحِدَةً ۖ وَلَا يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ ﴿١١٨﴾ إِلَّا مَن رَّحِمَ رَبُّكَ ۚ وَلِذَٰلِكَ خَلَقَهُمْ ...﴿١١٩﴾﴾.

واتە: وە ئەگەر پەروەردگارت ویستبای خەڵکی دەکرد بەیەك کۆمەڵ، بەڵام بەردەوام جیاواز دەبن، مەگەر ئەوەی کە پەروەردگارت بەزەیی پێیدا بێتەوە (بیهێنێتە سەر حەق) وە هەر بۆ ئەوەش دروستی کردوون، واتە: بۆ ئەوە دروستی کردوون کە بە ویستی ئازادانەی خۆیان سەرپشك بن، ئیمان هەڵدەبژێرن، یان کوفر هەڵدەبژێرن، خوا خەڵکی بۆ تاقیکردنەوە دروستکردوە و تاقیکردنەوەکەش لەوەدایە کە دەرفەتیان پێ بدات بە ئیرادەی ئازادانەی خۆیان ئیمان هەڵبژێرن، یان کوفر، خۆ ئەگەر خوا جەبری لەخەڵك کردبایە، ئنجا چ جەبری تەکوینیی (قدری)، وەك فریشتەکان کەبەکەڵکی تاقیکردنەوە نایەن، چونکە فریشتەکان بێ ئەوەی کە خۆیان بیانەوێ، خوای کاربەجێ وای خوڵقاندوون کە ناتوانن سەرپێچیی لە فەرمانی خوا بکەن و ناتوانن بێ ئیمان بن، یاخود جەبری تەشریعیی، واتە: ئەگەر خوای پەروەردگار ڕێگای دابایە شەریعەتەکەی زۆر لە خەڵکی بکات، ئەو کاتە خەڵك دەرفەتی تاقیکردنەوەی نەدەبوو و دەرفەتی ئەوەی نەدەبوو کە جێنشینایەتی خوا بکات، وە لەسەر زەوی تاقی بکرێتەوە.

٤- وە لەسوورەتی (الكهف) -٢٩- دا دەفەرموێ:

﴿وَقُلِ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ ۖ فَمَن شَآءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَآءَ فَلْيَكْفُرْ ...﴿٢٩﴾﴾.

واتە: بڵێ: وە حەق لە پەروەردگارتانەوەیە، کێ حەز دەکات، با ئیمان بێنێت و کێ حەز دەکات با کافر بێت.

کەواتە: شەریعەتی خوای پەروەردگار ڕێگای داوە بەخەڵك ئیمان بێنن، یاخود ئیمان نەهێنن، هەڵبەتە خوا ئیمانی پێ خۆشە و ڕقی لەکوفرە، وەك دەفەرموێ:

﴿وَلَا يَرْضَىٰ لِعِبَادِهِ ٱلْكُفْرَ ۖ وَإِن تَشْكُرُوا۟ يَرْضَهُ لَكُمْ﴾ الزمر -٧-.

واتە: (خوا ڕازی نیە بەندەکانی کافر بن (یان سپڵە بن) وە ئەگەر سوپاسگوزار بن، خوا پێی خۆشە و لەلای پەسەندە)، بەڵام خوای پەروەردگار ئەوەی کە پێی خۆشە، فەرزی نەکردوە، وەك فەرزێکی تەکوینیی جەبریان لێ بکات، هەروەها فەرزی تەشریعیشی نەکردوە کە ڕێگایان پێ نەدا بەلایەکی دیکەدا بڕۆن، ئەوەشی نەکردوە، بەڵام دیارە لەلای خۆیەوە ڕایگەیاندوە کە ئیماندارانی خۆش دەوێ، وە ڕقی لە کافرانە، کوفری ڕق لێهەڵدەستێ و ئیمانی خۆش دەوێ.

**شەشەم: خوا (سُبحانهُ وَتَعالى) دوایین کتێبی خۆی وە دواین پێغەمبەری خۆی بۆ سەرجەم مرۆڤایەتیی ڕەوانە کردوە:**

**لەو بارەشەوە ئایەت زۆرن، بۆ وێنە:**

١- خوا فەرموویەتی:

﴿تَبَارَكَ ٱلَّذِى نَزَّلَ ٱلْفُرْقَانَ عَلَىٰ عَبْدِهِۦ لِيَكُونَ لِلْعَٰلَمِينَ نَذِيرًا ۝١﴾ الفرقان -١-.

واتە: بەرزیی و پیرۆزیی و پاکیی بۆ ئەو کەسەی کە جیاکەرەوەی خۆی ناردۆتە سەر بەندەکەی، تاکو ترسێنەر و وریاکەرەوەبێت بۆ هەموو جیهانییان.

ئنجا ئایا بەندەکەی کێیە؟ موحەممەدە (صلى الله علیه وسلم)، کەواتە، هەم فورقانەکە و هەم بەندە هەڵبژێردراوەکەی، کە موحەممەدە (علیه الصلاة و السلام ) بۆ هەموو بەشەر ڕەوانە کراون.

٢- وە لە سوورەتی (التكویر) -٢٧ و ٢٨- دا دەفەرموێ:

﴿إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَٰلَمِينَ ۝٢٧ لِمَن شَآءَ مِنكُمْ أَن يَسْتَقِيمَ ۝٢٨﴾

واتە: ئەم قورئانە تەنیا یادخەرەوەیە. بۆ هەموو جیهانییان بۆ هەرکامێك لە ئێوە کە بیەوێ ڕاست بێ.

٣- هەروەها لە سوورەتی (الأنبیاء) -١٠٧- دا دەفەرموێ:

﴿وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَٰلَمِينَ ۝١٠٧﴾

واتە: بێگومان تۆمان تەنیا بۆ ئەوە ناردوە کە بەزەیی خوا بی بۆ هەموو جیهانییان.

**حەوتەم و كۆتایی: ژیانی دنیا شوێنی تێدا تاقیكرانەوەیە و، ڕۆژی دوایی شوێنی لێپرسینەوە و سزا و پاداشت وەرگرتنەوە و تەصفیە حیسابە:**

**ئەمەش ڕاستییەكە دیسان لەچەندان ئایەتی قورئان دا دروشێنراوتەوە. بۆ وێنە:**

١- لە سوورەتی (السَبَأ) - ٢٥ و ٢٦ -دا فەرموویەتی:

﴿ قُل لَّا تُسْـَٔلُونَ عَمَّآ أَجْرَمْنَا وَلَا نُسْـَٔلُ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٢٥﴾ قُلْ يَجْمَعُ بَيْنَنَا رَبُّنَا ثُمَّ يَفْتَحُ بَيْنَنَا بِٱلْحَقِّ وَهُوَ ٱلْفَتَّاحُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٢٦﴾ ﴾

(دیارە ڕووی دواندن لە پێغەمبەری خوایە (صلی الله علیه وسلم) واتە: تۆ بڵێ: ئێوە دەربارەی تاوانەكانمان لێتان ناپرسرێتەوە و، ئێمەش دەربارەی كردەوەكانی ئێوە لێمان ناپرسرێتەوە. بڵێ: پەروەردگارمان كۆمان دەكاتەوە، پاشان بە حەق دادوەرییمان لە نێوان دا دەكات، وەخوا دادوەرێكی زانایە، زۆر دادوەرێكی كارامەیە، وە زۆریش زانایە.

٢- وە لە سوورەتی (ق) - ٤٥ -دا دەفەرموێ:

﴿ نَّحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَقُولُونَ ۖ وَمَآ أَنتَ عَلَيْهِم بِجَبَّارٍ ۖ فَذَكِّرْ بِٱلْقُرْءَانِ مَن يَخَافُ وَعِيدِ ﴿٤٥﴾ ﴾

واتە: ئێمە زاناترین بەوەی كە دەیڵێن، وە تۆش بەسەریانەوە زۆر لێكەرنی، بۆیە تۆ هەر كەسێك لەهەڕەشەی من دەترسێ، بەم قورئانە بیترسێنە (ئەوەی كە ترسی خوای چووە دڵ باشە، ئەگەرنا تۆ بۆت نیە زۆریان لێ بكەی).

٣- وە لە سوورەتی (الغاشیة) -٢٥و٢٦-دا دەفەرموێ:

﴿ إِنَّ إِلَيْنَآ إِيَابَهُمْ ﴿٢٥﴾ ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا حِسَابَهُم ﴿٢٦﴾ ﴾

واتە: بێگومان گەڕانەوەیان بۆلای ئێمەیە. پاشان لێپرسینەوەشیان لەسەر ئێمەیە.

كەواتە: لێپرسینەوەیان لەسەر تۆ نیە، ئەی موحەممەد!

کەواتە: -وەك گوتمان- ئەم بڕگەی یەکەمە بەهەر حەوت خاڵەکەیەوە، بناغەی بڕگەکانی دیکەیە کە بریتین لە توێژینەوەمان دەربارەی نامسوڵمانان و چۆنیەتی مامەڵە لەگەڵ دا کردنیان لە کۆمەڵگا و دەوڵەتی ئیسلامییدا، بۆیە جارێکی دیکە بەپوختی دەیخەینەوە ڕوو:

**یەکەم:** خوا بەدیهێنەر و پەروەردگار و خاوەنی هەموو شتێك و هەموو کەسێکە بەبێ جیاوازیی، ئێمە دەڵێین: (الحمد لله رب العالمين) لە قورئان دا نەهاتوە کە ( الحمد لله رب المسلمين) خوا پەروەردگار و خاوەنی هەموو جیهانییانە و، خاوەنی هەموو کەسێکە بەبێ جیاوازیی.

**دووەم:** هەموو مرۆڤەکان لە خەلیفەی خوابوون و، ئەمانەت پێسپێردران و، ڕێزلێگیران و، بوونەوەر بۆ مەیسەرکران و تاقیکرانەوە و لێپرسینەوەدا، یەکسانن.

**سێیەم:** هەموو مرۆڤەکان لە ئەصڵ دا لە خێزانێکن و لەبنەڕەت دا کەس لە کەس گەورەتر نیە، بەهۆی ڕەگەز و ڕەنگ و ڕەچەڵەکەوە.

**چوارەم:** پێغەمبەرانی خوا و کتێبەکانی خوا بۆ هەموو لایەك هاتوون، کە دادگەرییان لە نێواندا بەرپا بکەن.

**پێنجەم:** هەموو مرۆڤەکان لەلایەن خوای پەروەردگارەوە، ئازادکراون و سەرپشك کراون، وە هەرچی کە دەیکەن بە ویستی ئازادانەی خۆیانە و، بۆیان هەیە بیکەن یان نەیکەن، وە هیچ شتێکیش لە ژێر کۆنترۆڵی ویستی فراوان و گشتگیری خوا دەرناچێت.

**شەشەم:** مرۆڤایەتیی هەمووی لەسەر میلاکی قورئان و موحەممەدە (صلى الله عليه وسلم) یانی: دوای هاتنی موحەممەد و دابەزینی قورئان، مرۆڤایەتیی هەمووی لەلایەن قورئانی دابەزێنراو و موحەممەدی نێردراوەوە، داوای لێکراوە کە بێتە ژێر چەتر و سێبەری ئیسلام.

**حەوتەم:** هیچ کەس بۆی نیە لەسەر ئیمان و کوفر تەصفیەی حیساب لەگەڵ کەس دا بکات، چونکە ئەوە تەنیا مافی خوایە، وە ئەوەش تەنیا لە دوارۆژدا دەکرێ.

ئێستاش دوای ئەوەی زانیمان تێڕوانینی ئیسلام بۆ ئینسان و ژیان و جیهان، بە واتایەکی دیکە: بوونناسیی ئۆنتۆلۆژی (Ontology) ئیسلامیی چۆنە؟ بابچینە سەر بەشی دووەمی ئەم تەوەرە.



ئایا دەوڵەتی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) كە یەكەم دەوڵەتی ئیسلامیی بوو بەدەستی موبارەكی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بەرد بەرد بنیات نرا، چۆن مامەڵەی لەگەڵ نامسوڵمانان دا كردوە؟

واتە: نامسوڵمانانێك كە لەژێر سایەی ئەو كۆمەڵگا و دەوڵەتەدا بوون، چۆن مامەڵەیان لەگەڵ دا كراوە؟ با تەماشا بكەین:

**جارێ پێش هەمو شتێك دەڵێین:**

ئەو دەوڵەتەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەوڵەتێكی فرە پێكهاتە (مُتَعدَّد - Plural) بوو، چونكە: مسوڵمانانی تێدابوون، ئەوانیش دوو پێكهاتەی سەرەكیی بوون:

أ- مسوڵمانانی كۆچكەر كە لەمەككەوە چووبوون.
ب- مسوڵمانانی پشتیوان كە خەڵكی مەدینە بوون.

هەروەها مسوڵمانانی مەككەش دیسان لە نێو خۆیان دا فرە پێكهاتە بوون و، چەند تیرە و هۆزێك بوون، هەروەها مسوڵمانانی مەدینەیش دوو هۆزی سەرەكیی بوون: ئەوس و خەزرەج، كە ئەوانیش لەنێو خۆیان دا چەند تیرەیەك بوون.

وە لەلایەكی دیكەوە جوولەكەكان هەبوون، ئەوانیش سێ هۆزی سەرەكیی بوون: [بنو قريظة و بنو النضير و بنو قينقاع]، پاشان موونافیقەكان هەبوون.

وە هەندێك لە هاوبەش پەیداكەرەكان هەرمابوون، وە مەدینە هەندێك نەصرانیشی تێدابوون، كەواتە: یەكەمین كۆمەڵگا و دەوڵەتێك كە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بنیاتی نا، بەناوی ئیسلامەوە، كۆمەڵگا و دەوڵەتێكی فرە پێكهاتە بوو.

ئنجا ئایا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) چۆن مامەڵەی لەگەڵ ئەو پێكهاتانەدا كرد؟ بەر لە هەرشتێك هەڵسا صەحیفەیەكی نووسی، كە بە وشەی: (الصَّحيفة) هاتوە، وە بە وشەی (الكتاب)یش ناوی هاتوە، وەمێژوونووسان بە وشەی (الوثيقة)یش ناویان هێناوە، كە لەجێی دەستووری ئێستایە، بۆ چۆنیەتی

مامەڵە پێکەوەکردنی پێکهاتە جۆراو جۆرەکانی ئەو کۆمەڵگا و دەوڵەتە، کە ئێمە کاتی خۆی بە درێژیی باسی ئەو صەحیفەیەمان کرد، وە دەقەکەیشمان بەتەواویی هێنا، لە کاتی توێژینەوەی یەکێك لە بنەمایەکانی سیستمی حوکمڕانیی ئیسلامیی دا: [ملکەچکردنی هەموو لایەك بۆ دەستوور و یاسا][1]، شایانی باسیشە ئەو صەحیفەیە (محمد حمیدالله) بە (أقدم دستورٍ مسجَّلٍ في العالم)، وە (د.أكرم ضياء العُمَرى) بە (أول دستور أعلنه الإسلام) پێناسەیان کردوە، واتە: [کۆنترین دەستووری تۆمارکراو لە دونیادا] و [یەکەمین دەستوور کە ئیسلام ڕایگەیاندوە و ئاشکرای کردوە][2].

ئێمە - وەك پێشتر باسمان کرد - کاتی خۆی زۆر دەربارەی ئەم صەحیفەیە قسەمان کرد و، لێرە ناگەڕێینەوە سەر ئەو قسانەی ئەو کاتە، بەڵام بە پێویستی دەزانین ئاماژەیەکی کورت بەهەندێك (بەند)ی ئەو صەحیفەیە بکەین، کە باسی چۆنیەتی مامەڵەکردنی دەوڵەتی ئیسلامیی دەکەن، لەگەڵ پێکهاتە جیاوازەکانی دا، بەتایبەت لەگەڵ ئەوانەدا کە نامسوڵمانن، بەڵام پێش ئەوە بە پێویستی دەزانم ئاماژە بە سێ خاڵی کورت بکەین:

**یەکەم:** ئەو پەیماننامەیە لە ڕووی سەنەدەوە، شارەزایان و پسپۆڕان دەڵێن: ڕاست و بێ گرێ وگۆڵە، بۆ وێنە: (عبدالله بن يوسف الجديع) لەو بارەوە گوتوویەتی: (وهي وثيقةٌ ثابِتةٌ نَقلاً)، وەك لە کتێبی: ( تقسيم المعمورة في الفقه الإسلامى)دا هێناویەتی[3]، هەروەها (د. أكرم ضياء العُمَرى) لە (السيرة النبوية الصحيحة) دا گوتوویەتی: لێم کۆڵیوەتەوە و سەنەدەکەی ڕاست و بێ گرێ و گۆڵە.

**دووەم:** ئەوە دەستوورە بە پێی سەرژمێرێك لە (٤٧) (بەند) پێك دێ، ئەو سەرژمێرییەی کە (محمد حمیدالله) کردوویەتی، وە بەپێی سەرژمێرییەکی دیکە، لە (٥٢) بەند، پێك دێت، کە دیارە (محمد حمیدالله) هەندێکیانی دابەش

---

(١) لەتەوەری دووەم داکە بەرگی دووەم گرتوویەتە خۆی.

(٢) مجموعة الثائق السياسية في عهد النبوة و الخلافة الراشدة، ص ٥٨.

(٣) ص٧٣.

کردوە بۆ برِگەی: (أ،ب) بۆیە کردوویەتی بە (٤٧) بەند، ئەگەرنا لە ڕاستییدا (٥٢) بەندە.

ئنجا لەو (٤٧) بەندە ئەگەر بەپێی سەرژمێری (محمد حمیدالله) بیکەین، لە بەندی یەك (١)ەوە تاکو بەندی بیست وسێ (٢٣)، واتە: نیوەی صەحیفە، دەربارەی پێکهاتەی سەرەکیی دەوڵەتی مەدینە، کە مسوڵمانانن، وە هاوبەش دانەرەکانن، دەدوێ، وە لەبەندی (٢٤) تا (٤٦) واتە: نیوەی دووەمی، جگە لەچەند بەندێکی گشتی، هەمووی دەربارەی جوولەکەکان دەدوێ، وە بەندی (٤٧) و کۆتایش بنچینەیەکی گشتییە بۆ هەموو لایەك.

شایانی باسیشە کە بەندەکانی ئەو صەحیفەیە زۆر ڕوونن، بەجۆرێك کە تەئویلی جۆراوجۆر هەڵنەگرن، کە ئەوەش یەکێکە لەو بنەمایانەی ڕەچاو دەکرێن لە نووسرانی ئەو دەستوورانەدا، کە بۆ بەڕێوەبردنی وڵات دادەنرێن، لەم ڕۆژگارەدا.

**سێیەم:** ئەو صەحیفەیە لە سەرەتای نیشتەجێبوونی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و مسوڵمانان و هاوەڵانی بەڕێزی لە مەدینەدا، نووسراوە، وەك (محمد حمیدالله) لە (مجموعة الوثائق السیاسة)دا هێناویەتی، لە ژێر ناوونیشانی: (القسم الثاني: العهد النبوي بعد الهِجرة ) وە بە (وثیقة)ی ژمارە (١) هێناویەتی بەناوونیشانی: (كتابُهُ بين المهاجرين والأنصار واليَهود، وهو دستورٌ لدولة البلدية بالمدينة)[١].

هەروەها (ابن هشام)یش لە (السيرة النبوية)دا لەدوای ناوونیشانی: (أول خُطَبِهِ بالمدينة)دا، ئەو وەسیقەیەی بەناوونیشانی: (الرسول يوادع اليهود) هێناوە[٢].

ئنجا بابێینە سەر چەند بەندێکی ئەوصەحیفەیە، کە پێویستن بۆ چۆنیەتی مامەڵەکردنی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەگەڵ پێکهاتەکانی دا:

---

(١) مجموعة الوثائق.. ص ٥٢.

(٢) السيرة النبوية لابن هشام، ج٢ص٢٦١، ٢٦٢.

**پێکهاتەی یەکەم:**

**بڕواداران (کۆچکەران و پشتیوانان):**

**بەندی (١):**

( هذا كِتابٌ من محمدٍ النَّبي رسولِ اللهِ، بينَ المؤمنين والمسلمين من قُريشٍ و أهل يثرب ومن تَبِعَهُم فَلَحِقَ بهم ومن جاهَدَ مَعَهُم).

واتە: ئەمە نووسراوێکە لە موحەممەد پێغەمبەر و ڕەوانەکراوی خواوە، لە نێوان بڕواداران و مسوڵمانان لە قورەیش، وە خەڵکی یەسریب دا، وە ئەوەی کە شوێنیان دەکەوێ و پێیانەوە پەیوەست دەبێت، وە لەگەڵیان دا جەنگ و جیهاد دەکەن.

**بەندی (٢):**

(إنَّهـم أُمـةٌ واحِـدةٌ مـن دونِ النـاس).

واتە: ئیمانداران [لە کۆچکەران و پشتیوانەکان] کۆمەڵێکن لەخەڵکی دیکە جیان و کۆمەڵێکی سەربەخۆن.

**بەندی (٣):**

(المهاجرون من قريشٍ على رَبْعَتِهِمْ يتعاقلون بينهم، وهم يفدون عانيهم بالمعروف والقسط بين المؤمنين).

واتە: کۆچکەرانی قورەیش، [واتە: ئەوانەی لە مەککەوە هاتوون] لە نێوان خۆیان دا خوێن دەدەن، وە فیدیەی دیلەکانی خۆیان دەدەن، بەشێوەیەك کە بەچاك زانراوە و، بەشێوەی دادگەرانە لە نێوان ئیمانداران دا.

**بەندی (٤):**

(وبنو عوفٍ على رَبْعتهم يتعاقلون معاقلهم الأولى، وكل طائفةٍ تَفْدي عانيها بالمعروف والقسطِ بين المؤمنين).

واتە: بەنو عەوفیش وەك عادەتی پێشوویان، خوێن لە نێوان خۆیان دا دەدەن، و هەر کۆمەڵێك دیلەکەی خۆی بەشێوەیەك کە بەباش زانراوە و بە دادگەرانە لە نێوان ئیمانداران دا، فیدیەی بۆ دەدەن.

**بەندی (١٢):**

(وأن المؤمنين لا يتركون مفرحاً بينهم أن يعطوهُ بالمعروف في فداءٍ أو عقلٍ).

واتە: وە ئیماندران لێناگەڕێن هیچ قەرزدراێکیان لە نێوان دا هەبێت، مەگەر بەشێوەیەکی هەق بیدەنێ، جا چ کڕینەوە بێت ئەگەر دیل بێت، چ بۆ خوێن بێت ئەگەر خوێنێکی بکەوێتەسەر.

**بەندی (١٣):**

(وأن المؤمنين المتقين أيديهم على كل من بغى منهم و آبتغى سَيعةَ ظلمٍ، أو إثماً أو عدواناً او فساداً بين المؤمنين، وأن أيديهم عليه جميعاً ولو كان ولد أحدِهم).

واتە: وە ئیماندارانی پارێزکار دەستیان لەسەر هەرکەسێکە کە ستەم بکات، یان بیەوێ ستەم و زۆر بکات، یان گوناحێك بکات، یان دەست درێژییەك بکات، یان خراپە و ئاشووبێك لەنێوان ئیمانداران دا بەرپا بکات، هەموویان دەستیان لە دژی و لەسەریەتی، ئەگەر کوڕی یەکێکیشیان بێت.

**بەندی (١٦):**

(وأنه من تبِعَنا من يهود فإنَّ لهم النَّصْرُ والأسوة غيرَ مظلومين ولا متناصرٍ عليهم).

واتە: وە هەرکەسێك لە جوولەکەکان شوێنمان بکەوێ و لەگەڵمان بێت، ئەوە پێویستە سەربخرێ و یارمەتیی بدرێ، وە پێویستە بەیەکسانیی مامەڵەیان لەگەڵ دا بکرێ، نە ستەمیان لێ بکرێ و نە یارمەتی هیچ دوژمنێکیش بدرێ لە بەرانبەریان دا.

**پێکهاتەی دووەم: هـاوبەشـدانــەران:**

**بەندی (٢٠):**

(وأنه لا يجير مُشرِكٌ مالاً لِقريش ولا نفساً ولا يحولُ دونَهُ على المؤمنين).

واته: نابێ هیچ هاوبەش دانەرێك هیچ ماڵێك بۆ قورەیشییەکان، یان کەسێك بۆ قورەیشییەکان پەنا بدات، وە ڕێگا بگرێ لە ئیمانداران کە ئەو ماڵە بە دەستکەوت بگرن، یان زەفەر بەوە کەسە بەرن [واته: هیچ هاوبەش دانەرێك کە لەمەدینەدا دادەنیشێ، بۆی نیە ماڵ و نەفسی قورەیشییەکان کە دوژمنی ئیماندارانن - لەوکاتەدا دوژمنیان بوون و لەگەڵیان دا لەجەنگ دا بوون- بۆی نیە پەنای بدات].

**پێکهاتەی سێیەم: جوولەکەکان:**

**بەندی (٢٥):**

(وأنَ يهودَ بني عَوفٍ أُمَةٌ مَعَ المؤمنين، لليهودِ دينُهم وَللمُسلمينَ دينُهم، مَوالِيهم وَأنفُسُهم الاّ من ظَلَمَ وَأثِمَ فإنَ لا يُوتِغُ الا نَفسَه وَأهلَ بَيتِهِ).

واته: جوولەکانی بەنی عەوف کۆمەڵێکن لەگەڵ ئیمانداران دا، جوولەکەکان دینی خۆیان بەکاردێنن، وەمسوڵمانانیش بەدینی خۆیانەوە پابەند دەبن، خۆیان و ئەوانەش کە لەگەڵیان دا هاوپەیمانن، مەگەر کەسێك ستەم بکات و گوناح بکات، ئەوە تەنیا زیان لە خۆی و لە کەس و کارەکەی دەدات.

**بەندی (٣٧) برگەی ( أ ):**

( وأن على اليَهودِ نَفَقَتُهم وَ على المسلمينَ نَفَقَتُهم، وَأنَّ بينَهم النصرُ على من حاربَ أهل هذهِ الصحيفة، وأنَّ بينَهم النصحُ وَ النصيحة وَالبِرُّ دونَ الإثم ).

واتە: وە جوولەکەکان خەرجیی و مەصرەفی خۆیانیان لەسەرە و مسوڵمانانیش خەرجیی و مەصرەفی خۆیانیان لەسەرە، وە لەبەینیان دا یەکدی سەرخستن هەیە لەبەرانبەر هەرکەسێك دا کە دژی ئەهلی ئەو صەحیفەیەبێ [واتە: ئەم دەستوورە هەموو ئەوانەی کە دانیان پێدا هێناوە، هەرکەسێك دژی ئەو کەسانە بێت کە لە ژێر سایەی ئەو دەستوورەدا ژیان دەگوزەرێنن، یانی لەو قەوارە ئیسلامییەدا، پێویستە هەموویان لەبەرانبەریان دا یەك دەست بن، بە مسوڵمان و جوولەکەوە] وە پێویستە لەگەڵ یەکدی و بۆ یەك دڵسۆزبن و، چی چاکەیە لەگەڵ یەکدیدا بیکەن، وە پێویستە خۆیان لە گوناح بپارێزن بەرامبەر بەیەکدی.

**بەندی (٣٧) برگەی ( ب ):**

( وأَنه لايَأْثَمُ أُمرُؤٌ بِحَلِيفِهِ وأنَّ النصرَ للمَظلومِ).

واتە: وە هیچ کەسێك بەهۆی هاوپەیمانەکەیەوە تووشی گوناح نابێت [واتە: ئەگەر کەسێك هاوپەیمانەکەی هەڵەیەکی کرد، ئەو باجی هەڵەکەی نادات] وە هەرکەسێك ستەمی لێ بکرێ، پێویستە سەربخرێت و پشتی بگیرێ و زوڵمەکەی لەسەر لابچێت.

**بەندی (٣٨):**

( وأَنَّ اليهودَ يُنفِقونَ مع المؤمنين ماداموا مُحاربِينَ) .

واتە: جوولەکەکان مەسرەف دەکێشن لەگەڵ ئیمانداران دا، تاکو ئیمانداران لە جەنگ دابن، پێویستە جولەکەکان کە بەشداریی جەنگ ناکەن، لەگەڵیان دا خەرجیی و مەصرەفی جەنگ بکێشن، [چونکە هەموویان دیفاع لە وڵاتێك و دەوڵەتێك دەکەن، کە سایە و سێبەری هەموو لایەکە].

**بەندی (٣٩):**

( وأن يثربَ جوفها حرامٌ لأهلِ هذهِ الصحيفة )

واتە: وە نێو شاری یەسریب قەدەغەیە لە هەموو ئەوانەی کە ئەم صەحیفەیان ئیمزاکردوە [واتە: هیچ کەسێك نابێت لەڕووی هێمنیی و ئاساییشەوە، شتێك بکات کە زیانی بۆ دانیشتوانی نێو شاری یەسریب و دەوروبەری هەبێ].

**بەندی (٤٢):**

( وأنَّهُ ماكانَ بينَ أهلِ هذهِ الصحيفةِ من حَدَثٍ أو اشتجارٍ يُخافُ فسادُهُ، فإنَّ مرَدَّهُ الى اللهِ والى محمدٍ رسولِ الله، وأنَّ اللهَ على أتقى مافي هذهِ الصحيفةَ وَأَبَرِّهِ) .

واتە: وە هەرشتێك لەنێوان ئەهلی ئەم صەحیفەیەدا [ئەوانەی ئەم دەستوورەیان ئیمزا كردوە] بوو، ڕووداوێك بوو، یاخود دەمەقاڵێیەك بوو، كە مەترسیی ئەوەی هەبوو بتەنێتەوە و تەشەنە بكات، ئەوە پێویستە بگێڕدرێتەوە بۆلای خوا، وە بۆلای موحەممەد پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) [واتە: ئەوان مەرجیعن: قورئان و سوننەت، یان شەریعەت]، وە خوا (سُبحانَهُ وَتَعالى) ڕازییە بەوەی كە چۆن پارێزكارانەترەو چۆن چاكترە، بەپێی ئەم صەحیفەیە، ئا بەو شێوەیە مامەڵە بكرێ.

**بەندی (٤٤):**

(وأنَّ بينهم النصرُ على من دَهَمَ يَثرِبَ).

واتە: وە پێویستە هەموویان یەكدەست بن لەبەرانبەر هەركەسێك دا، كە هێرش دەكاتە سەر یەسریب [واتە: مەدینە].

**بەندی (٤٥) برگەی ( أ ):**

( وإذا دُعوا الى صُلحٍ يُصالِحونَهُ وَ يَلبَسونَهُ فإنَّهُم يُصالِحونهُ ويلبسونهُ، وأنهُم اذا دَعُوا الى مِثلِ ذالِك، فإنهُ لَهم على المؤمنين الاّ مَنْ حاربَ في الدين)

واتە: وە هەركاتێك جوولەكەكان بانگ كران بۆ ڕێككەوتنێك كە ئەنجامی بدەن [تەرەفێكی دیكە بانگی كردن كە ڕێككەوتنێكیان لەگەڵ دا بكات] ئەوە بۆیان هەیە كە بیكەن و بچنە نێوی، هەروەها خۆشیان بۆیان هەیە كە بانگی تەرەفێكی دیكە بكەن و ڕێككەوتننامەیەكی لەگەڵ دا بكەن، ئەو حەقەیان هەیە لەسەر ئیمانداران، [واتە: ئازادن لەوەدا كە پەیمان ببەستن لەگەڵ هەر لایەنێك دا، چ داوایان لێ بكرێت، چ خۆیان دەست پێشخەر بن] مەگەر كەسێك دژی دین بێت [واتە: كەسێك كە دژی ئیسلام و ئەو قەوارە ئیسلامییە بێ، نابێ

ئەوان ڕێککەوتنی لەگەڵ دا بکەن، هەروەك مسوڵمانانیش ڕێککەوتن لەگەڵ لایەنێك دا ناکەن کە دژی جوولەکە بێت].

**بەندی (٤٥) برگەی ( ب ):**

( على كُلِ أناسٌ حِصَّتُهم من جانِبِهم الذي قِبَلَهم ).

واتە: هەرکۆمەڵە خەڵکێك ئەو پشکەی کە دەکەوێتە سەریان، پێویستە ئەو نەفەقەو خەرجییە بدەن کە دەکەوێتە سەریان لەهەر ڕوویەکەوە بێت .

**بەندی (٤٧):**

( وَأنهُ لا يَحُول هذا الكِتابُ دونَ ظالِمٍ أو آثِمٍ، و أنهُ من خرَجَ آمنٌ، وَمَن قعَدَ بالمدينةَ آمِنٌ، الاّ مَن ظلَمَ وَ أَثِمَ، وَأَنَّ اللهَ جارٌ لِمن بَرَّ واُتقى، وَمحمدٌ رسولُ الله (صلى الله عليه وسلم))

واتە: وە ئەم کیتابە [ئەم دەستوورە] نابێتە ڕێگر لە بەرانبەر هەرکەسێك دا کە ستەم بکات یان گوناه بکات [کە دەبێت سزای خۆی وەربگرێ] وە هەرکەسێك ئازادە لە مەدینەدا دابنیشێت، یاخود لە مەدینە بچێتە دەرەوە، [پێویستە هێمنیی و ئاساییشی پارێزراو بێ] مەگەر کەسێك ستەم بکات و گوناح بکات، وە خوا (سُبحانَهُ وَتَعالی) پشتی هەرکەسێك دەگرێ کە ئەهلی تەقوایە و موحەممەد ڕەوانەکراوی خوایە.

ئەگەر سەرنجی تێکڕای ئەو بەندانە بدەین، کە ئێمە بەنموونەمان هێنانەوە، لەو صەحیفە (٤٧) بەندییەدا کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) کردی بە بناغەی بەڕێوەبردنی دەوڵەتەکەی، وە بناغەی مامەڵەکردنی لەگەڵ سەرجەم پێکهاتەکانیدا، چەند ڕاستییەکمان بۆ دەردەکەون، کە ئێمە بەکورتیی ئاماژەیان پێ دەکەین:

**پێکهاتەی یەکەم:مسوڵمانان:**

**١- بەندی یەکەم: کە دەڵێت:**

( هذا كِتابٌ من محمدٍ النبي رسولِ اللهِ بينَ المؤمنين ... ) ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە لایەنی پەیماندەر کێیە، ئەو لایەنەی کە دەوڵەتی پێکهێناوە و مامەڵە لەگەڵ پێکهاتەکاندا دەکات، کە پێغەمبەری خوایە (صلى الله عليه وسلم)، وە ئیماندارانێك کە لە خزمەتیدان، لە کۆچکەران و پشتیوانان، واتە: مسوڵمانانیش دوو پێکهاتەی سەرەکیین، کە کۆچکەرانن کەلە هۆزی قورەیشن و لەمەککەوە هاتوون، وە پشتیوانان کە خەڵکی یەسریبن، واتە: مسوڵمانانیش لە نێو خۆیان دا فرە لایەن بوون.

**٢- بەندی دووەم : کە دەڵێت:**

( إنهّم أُمةٌ واحِدَةٌ من دونِ الناس ) کەواتە: ئەمە قەوارەیەکی سیاسی تازەیە، ئەو قەوارە سیاسییە کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) پێکی هێناوە و، ئەو مسوڵمانانە کۆمەڵێکن جیا لەخەڵك، واتە: قەوارەیەکی تایبەتیی و سەربەخۆن.

**٣- بەندی سێیەم : کە دەڵێت:**

( المهاجرون من قُريشٍ على ربعَتِهم يتعاقلون بينهم، وهم يَفْدونَ عانيهم بالمعَروفٍ و القسطِ بين المؤمنين ).

**٤- وە بەندی چوارەم کە دەڵێت:**

( وبنو عوفٍ على ربعتِهم يتعاقلونَ معاقِلهم الأولى، وكل طائِفةٍ تَفدِي عانيها بالمعروفِ والقسطِ بين المؤمنين ) .

ئەو دوو بەندە باسی ئەوە دەکەن کە پێی دەگوترێ: (ئۆباڵداریێتیی کۆمەڵایەتیی، ئۆباڵداریێتی ئابووریی)، (التكافل الأجتماعي، التكافل الاقتصادي) چونکە

دەڵێ: کۆچکەران لە قورەیش بە پێ ی عادەتی پێشییان خوێن لە بەینی خۆیان دا دەدەن، وە ئەگەر کەسێکیان لێ بەدیل بگیرێ و پێویست بەوە بکات کە فیدیە بدات، ئەوە پێکەوە فیدیە دەدەن، بەڵام بە دادگەرانە لە نێوانی ئیمانداران دا، هەروەها دواتر باسی بەنی عەوف دەکات، کە دیارە مەبەست پێی ئەنصارییەکانە، ئەوانیش بە هەمان شێوە، وە دوایی دەفەرموێ: (وكُلُّ طائفةٍ تَفْدي عانيها بالمعروفِ والقسطِ بينَ المؤمنين) هەر کۆمەڵێك دیلی خۆی دەکڕێتەوە لە نێو خۆیان دا بەشێوەیەکی دادگەرانە، وە هەرکەسە پشك و بەشی خۆی دەدا، بۆ ئەوەی ئەو دیلە بکڕێتەوە.

**٥- هەروەها بەندی دوازدە: کە دەڵێت:**

(وأن المؤمنين لايتركون مُفْرحَاً بينهم أن يعطوه في فداءٍ أو عقل) واتە: وە ئیمانداران لێناگەڕێن هیچ قەرزدارێکیان لە نێودا هەبێت، کەوتبێتە بن باری قەرزەوە، بەشێوەیەکی چاك و پەسەندانە دراوی پێ دەدەن، وەك فیدیە یان وەك خوێن.

**٦- بەندی سێزدە: کە دەڵێت:**

(وَأن المؤمنين المتقين أيديهِم على كُلِ من بغى مِنهُم او ابتَغى دَسيعة ظُلمٍ أو إثماً أو عُدواناً أو فَساداً بينَ المؤمنين، وَ أَنَّ أيديَهُم عليهِ جَميعاً وَلَو كانَ وَلَدَ أحَدِهم) واتە: وە ئیماندارانی پارێزکار لە بەرانبەر هەرکەسێك دا کە ستەمێك یان گوناهێك یان دەستدرێژییەك یان خراپەکارییەك دەکات، لە نێوان ئیمانداران دا هەموویان لەبەرانبەری دا یەکدەستن، ئەگەر ڕۆڵەی یەکێکیشیان بێ، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە دەبێ یەکدەستیی هەبێ لەبەرانبەر خراپەکاران دا، بۆ ئەوەی ڕێگا بگیرێ لە ستەم و خراپەکاریی و دەستدرێژیی.

**٧- بەندی شازدەیەم: کە دەفەرموێ:**

(وأنَّهُ من تَبِعَنا من يهودٍ فإن لهُ النصرُ و الأُسوةُ غيرَ مَظلومينَ ولا مُتَناصَرٍ عَلَيهِم)، واتە: ئەوەی کە شوێنمان کەوت لە جوولەکەکانیش [واتە: لەگەڵمان دا بوو بە هاوپەیمان و گرێبەستی لەگەڵ دا کردین و بوو بەهاووڵاتیی] پێویستە

سەربخرێ و بەیەکسانیی مامەڵەی لەگەڵ بکرێ، نەستەمیان لێبکرێ و نە لە بەرانبەریان دا پشتی هیچ دوژمنێکیشیان بگیرێ.

کەواتە: مسوڵمانان لەسەر بناغەی یەکسانیی و پشتیوانیی لێکران، مامەڵەیان لەگەڵ دا دەکرێ، ئەوە بەنسبەت پێکهاتەی یەکەم.

### پێکهاتەی دووەم: هاوبەشدانەران:

تەنیا لە بەندی بیست دا، دەستوورەکەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) باسیان دەکات و دەفەرموێ: (وأنهُ لا يُجيرُ مُشرِكٌ مالاً لقُرَيشٍ ولا نَفساً ولا يَحولُ دونهُ على المؤمنين) هیچ هاوبەش بۆ خوا دانەرێك کە لە دەوڵەتی ئیسلامییدا هەن و لە مەدینەدا ماون، بۆی نیە کە ماڵێك پەنا بدات بۆ قورەیشییەکان - کە قورەیشییەکان ئەو کاتە دوژمنی مسوڵمانان بوون، واتە: قورەیشییە بتپەرستەکان - هەروەها بۆی نیە هیچ کەسێك پەنا بدات، کە دوژمنە و سەر بەقورەیشە.

وە ببێتە سوپەری لە بەرانبەر ئیمانداران دا، چونکە قورەیش لە حاڵەتی جەنگ دا بوون، کەواتە: هیچ پێکهاتەیەکی نێو دەوڵەت و کۆمەڵگای ئیسلامیی بۆی نیە دوژمنێکی ئەو کۆمەڵگا و دەوڵەتە پەنا بدات و بەرگریی لێ بکات، ئەوەش شتێکی بەڵگە نەویستە.

### پێکهاتەی سێیەم:جوولەکەکان:

پێشتر بەندەکانیمان خوێندنەوە، لە بەندی - ٢٥ - دا کە دەڵێ: (وە جوولەکەکانی بەنی عەوف ئۆممەتێکن لەگەڵ ئیمانداران دا، جوولەکەکان بەدینی خۆیان، وە مسوڵمانەکان بەدینی خۆیان، مەگەر کەسێك کە ستەم و گوناح بکات، ئەوە تەنیا زیان لە خۆی دەدات) ئەمە چی لێوەردەگیرێ؟ ئەوەی لێوەردەگیرێ کە بەڵێ، لەلایەکەوە مسوڵمانان و ئیمانداران کۆمەڵێکن قەوارەیەکی سیاسییان پێکهێناوە، بەڵام لە لایەکی دیکەوە، ئەم بەندە دان بەوەدا دێنێت کە جوولەکەکانیش بۆ خۆیان قەوارەی خۆیان هەیە: ( وأنَّ يهودَ بني عَوفٍ أُمَّةٌ معَ المؤمنين) ئەوانیش قەوارەی

سیاسی و کۆمەڵایەتیی خۆیانیان هەیە و، ئیدارەی خۆیانیان هەیە، ئەمەش زۆر شتی لێ هەڵدەهێنجرێ: واتە: جوولەکەکان، وەك خۆیان کۆمەڵێکن و قەوارەیەکیان هەیە، بەڵام لەگەڵ ئیمانداران دا، قەوارەیەکی فراوانتر پێك دێنن، وەهەرکەسە بە دینی خۆی، وە هیچ کەسێکیش بەرگریی لێ ناکرێ و لەسەری ناکرێتەوە، مادام ستەم بکات و خراپە بکات، مسوڵمان بێت یان جوولەکە بێت.

**بەندی (٣٧) برِگەی ( أ ): کە دەڵێت:**

(وأنَّ على اليَهودِ نَفَقَتَهم، وَ على المسلمينَ نَفَقَتُهم، وأَنَّ بينَهم النصرُ على من حاربَ أهلَ هذهِ الصحيفة) واتە: لە ڕووی ئابوورییەوە هەرکەس تەحەمولی نەفەقەو خەرجییەکانی خۆی دەکات، بەڵام هەموویان پێویستە بۆ یەك دڵسۆزبن وەپشتی یەکدی بگرن، لە بەرانبەر هەر کەسێك دا کە دژی ئەو قەوارە سیاسییەیە کەبە هەموویان پێکیان هێناوە.

**بەندی (٣٧) برِگەی ( ب ): کە دەڵێت:**

(وَأنهُّ لايَأثَمُ آمرؤٌ بِحَلِيفهِ وأنَّ النصرَ للمَظلومِ) هیچ کەسێك باجی هەڵەی هاوپەیمانێکی خۆی یان خزمێکی خۆی نادات، وە هەرکەسێك ستەمی لێ بکرێ، پێویستە سەربخرێ.

**بەندی - ٣٨ - : کە دەڵێت:**

(جوولەکەکان لەگەڵ ئیمانداران دا خەرجیی جەنگ دەکێشن، تاکو ئیمانداران لە جەنگ دا بن) واتە: پێویستە هاوکاریی ئابوورییان بکەن مادام بە کردەوە بەشداریی جەنگ و جیهاد ناکەن، پێویستە هاوکاریی مادییان بکەن.

**بەندی ٣٩ - : کە دەڵێت:**

(وأن يثرب جوفها حرام على أهل هذه الصَّحيفه) وە نێو یەسریب پێویستە هێمنیی و ئاسایشی بپارێزرێت و قەدەغەیە لەو کەسانەی کە ئەم صەحیفەیان ئیمزا کردوە، واتە: هیچ کەسێك نابێ خراپەکاریی و ئاشووب و ئاژاوە لە نێو مەدینەدا بەرپا بکات.

**بەندی -٤٢ - : کە باسی ئەوە دەکات:**

هەر ناکۆکیی و دەمەقاڵێ و گرفتێك بوو پێویستە بگێڕدرێتەوە بۆلای خوا و بۆلای پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) واتە: بۆلای قورئان و سوننەتی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەبێت مەرجیعێك هەبێت بۆ یەکلایی کردنەوەی گرفتەکان، کە دیارە ئەوە دەستەڵاتی دادوەریی دەگەیەنێ، بەزاراوی ئەمڕۆ، یانی: کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) وەك چۆن سەرۆکی دەوڵەت بووە، هەر بەهەمان شێوە دادوەریش بووە و دادگەریش بووە.

**بەندی -٤٤- کە دەڵێت:**

[وە پێویستە هەرکەسێك هێرشی کردە سەر یەسریب هەموویان لەبەرانبەری دا یەکدەست بن] کەواتە: بەرانبەر بە دوژمنان، هەموو پێکهاتەکانی ئەو کۆمەڵگا و ئەو دەوڵەتە ئیسلامییە، دەبێ یەکدەست بن.

**بەندی -٤٥ - بڕگەی - أ : کە باسی ئەوە دەکات:**

جوولەکەکان بۆیان هەیە چ بانگ بکرێن، چ خۆیان دەستپێشخەربن، کە هاوپەیمانێتیی بکەن، وە ڕێککەوتن بکەن لەگەڵ هەر لایەنێك دا، مەگەر دژی ئیسلام و مسوڵمانان بێت، کەواتە: لە ڕووی سیاسییەوە، ئازاد و سەربەخۆن.

**وە بەندی -٤٥ - بڕگەی ب - : کە دەڵێ:**

لەڕووی ئابوورییەوە، هەرکەسە خەرجیی و مەسرەفی خۆی دەکەوێتەسەر، جا چ دیلێك ئازاد بکەن، چ قەرزدارێکیان هەبێت، چ خوێنێکیان بکەوێتەسەر، پێویستە هەرکەسە تەحەمولی نەفەقەی ئەو کۆمەڵەی خۆی بکات، ئەمیش لە ڕووی ئابوورییەوە نوختەی خستوونەسەرپێتان.

**وە بەندی -٤٧ - و کۆتایی: کە دەڵێ:**

(ئەم کیتابە نابێتە ڕێگر لەبەرانبەر تۆڵستاندنەوە لە هەر کەسێك کە ستەم و خراپە بکات)، واتە: خراپەکار دەبێ سزابدرێ: مسوڵمانە، جوولەکەیە، موشریکە،

مونافیقە، هەرکەسێکی هەیە، پاشان باسی ئەوە دەکات کە هەرکەسێك بیەوێ لەمەدینەدا دادەنیشێ، وە هەرکەسێك بیەوێ دەچێتە دەرەوەی مەدینە، واتە: بۆ هاتن و چوون و ڕۆیشتنە دەر و نیشتەجێبوون لە مەدینەدا، پێویستە ئاساییش و هێمنیی هەموو لایەك پارێزراو و بەرقەراربێت.

ئنجا شایانی باسە لەم صەحیفەیەدا کە (٤٧) بەندە، یان (٥٢)، نۆ جار وشەی (قسط)وە یەك جار وشەی ( عدل) هاتوون، واتە: بە هەردووکیان (١٠) جار دووبارە بوونەتەوە و هەردووکیان بەمانای دادگەریی دێن، بەڵام (قسط) زیاتر لایەنی ماددیی و (عدل)یش زیاتر لایەنی مەعنەویی دەگرنەوە.

لێرەوەش بۆمان دەردەکەوێ کە بە ڕاستیی دادگەریی بەهایەکی زۆر گرنگ و بەرزە، چونکە: دە (١٠) جار لەو صەحیفەیەدا هاتوە، کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) وەك دەستوورێك دایناوە.

ئنجا ئەگەر بە گشتی سەرنجی ئەو صەحیفەیە بدەین کە بناغەی هەڵسوکەوتی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بووە لەگەڵ هەمووپێکهاتەکانی دەوڵەتەکەی و کۆمەڵگایەکەیدا، بەتایبەت نامسوڵمانەکان کە بە زۆریی جولەکەکان بوون، چیمان بۆ دەردەکەوێ؟ ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە زۆر تەئکید کراوەتەوە لەسەر ئەوەی هەموو ئەوانەی لەو کۆمەڵگایەدان و لە ژێر سایەی ئەو قەوارە سیاسییەدان، پێویستە بەدادگەریی مامەڵەیان لەگەڵ بکرێ، وە پێویستە بەرگرییان لێ بکرێ، وە پێویستە بەیەکسانیی تەماشایان بکرێ، وە پێویستە ڕێزیان لێ بگیرێ و تایبەتمەندییەکانیان پارێزراوبن، وە هەموو ئەرك و مافەکانیان وەك یەك وان، جگە لە و شتانەی کە تایبەتمەندیی هەر لایەکیانن، بەڵام دیارە: کە پێغەمبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) بەپێی ئەو شەریعەتەی لە دەستی دا بووە، ئەو مەرجیعە، واتە: خۆی، ئەو لایەنەیە کە دەبێت بۆلای بگەڕێنەوە لە کاتێك دا کە کێشە و گرفت و دەمەقاڵێیەك دێتە پێش.

دیارە جوولەکەکان و هەموو ئەوانەی کە لە مەدینەدا بوون، متمانەیان بە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بووە و ئەو صەحیفەیان لەگەڵدا ئیمزا کردوە.

ئێستاش بێینە سەر بەشی سێیەمی ئەم توێژینەوەیەمان:

## بەشی سێیەم

# ئەزموونی دەوڵەتی ئیسلامیی دوای پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) و خەلیفە ڕاشیدەکانی لە بواری هەڵسوکەوت لەگەڵ هاووڵاتییانی نامسوڵمان دا

ئایا نامسوڵمانانێك كە ئامادەبوون سەر بە دەوڵەتی ئیسلامیی بن و لە ژێر سایەی دا بژین، لە دوای پێغەمبەری خوا (صلى الله علیه وسلم) و چوار جێنشینە سەرڕاستەكانی - كە بە تەئكید ئەوانیش هەر بەو شێوەی پێغەمبەری خوا (صلى الله علیه وسلم) لە هێڵە گشتییەكان دا مامەڵەیان لەگەڵ نامسوڵمانان دا كردوە - وەك لە داهاتوودا ئاماژە بەهێندێك شت دەكەین - ئایا حاڵ وباڵیان لە دەوڵەتی ئیسلامیی دا لە دوای چاخ و سەردەمی پێغەمبەری خوا (صلى الله علیه وسلم) و خەلیفە ڕاشیدەكانی دا چۆن بووە؟ وە دەوڵەتی ئیسلامیی چۆن مامەڵەی لەگەڵ دا كردوون، لە كاتێكدا كە لە ژێر سایەی دا ژیاون؟ دەڵێین: جارێ بە پێی تێڕوانینی ئیسلام بۆ ئینسان و ژیان و جیهان (كە لە بەشی یەكەم دا خستمانە ڕوو)، وە بەگوێرەی ئەو صەحیفەیەی كە پێغەمبەری خوا (صلى الله علیه وسلم) كردی بە دەستووری دەوڵەتی مەدینە، پێویستە سەرجەم ئەوانەی لە سایەی دەوڵەتی ئیسلامیی دا دەژین، كە تایبەتمەندیی هەرەسەرەكیی ئەو دەوڵەتە بریتیە لە چەسپاندنی دادگەریی، وە دادگەرییش بە بێ یەكسانیی نایەتە دی، بەڵێ پێویستە سەرجەم دانیشتوانی نێو دەوڵەتی ئیسلامیی، لە هاووڵاتێتییدا یەكسانبن و وەك یەك لە ماف و ئازادییەكان دا بەهرەمەند بن، ئاوا چاوەڕوان كراوە، بەڵام ئەوەی تێبینی دەكرێ: لە زۆربەی قۆناغەكانی دەوڵەتی ئیسلامییدا، وەك گوتراوە: (الإنصاف خیر الأوصاف) ئینسان دەبێ چی حەقە ئەوە بڵێ، بەڵێ لە زۆربەی قۆناغ و چاخەكانی دەوڵەتی ئیسلامییدا، لادانی زۆر لەو بوارەدا هەبووە، هەرچەندە ئەگەر بێت و دەوڵەتی ئیسلامیی بەراورد بكەین لەگەڵ دەوڵەتەكانی ئەوسای دنیادا، دەوڵەتی ئیسلامیی ئیمتیازی زۆری لەو بوارەدا بەسەر دەوڵەتەكانی دیكەوە هەبوون و، زۆر لە دادگەرییەوە و، لە ئینصاف و لەیەكسانییەوە نزیكتر بووە، بەڵام بەبەراوردی ئەو دەوڵەتە ئیسلامییانە، لەگەڵ ئەوەدا كە پێغەمبەری خوا (صلى الله علیه وسلم) و خەلیفەكانی مامەڵەیان پێ لەگەڵ نامسوڵمانان دا كردوە و، بەبەراورد لەگەڵ ئەوەدا كە قورئان و سوننەت دەیڵێن: كەم و كوڕیی زۆر هەبووە، لە زۆربەی دەوڵەتەكان، یاخود لە زۆر لە ئاڵقەكانی زنجیرەی دەوڵەتی ئیسلامیی دا.

ئێمە ئەگەر وەك نموونەیەك ئاماژە بکەین، بەکتێبی: (الأَحكام السلطانية والولايات الدينية)ی (الماوردي) دەبینین چەندان بیروبۆچوونی هەڵە و کرچ و کاڵ، بەناوی دەوڵەتی ئیسلامییەوە لە بواری مامەڵەکردن لەگەڵ نامسوڵمانان دا پەیدابوون.

بۆ وێنە:

لە لاپەڕە (٢٢٩)دا (الماوردي) لە باسی مەرجەکانی گرێبەستی سەرانە (عقد الجزية) دا، باسی دوو جۆرە مەرج دەکات، بۆ خاوەن کتێبەکان، کە پێیان دەڵێ: (الشروطُ المُستَحَّقةَ و الشروط المُستَحَبَّة) ئەو مەرجانەی کە فەرزن و ئەو مەرجانەی کە پەسەند و سوننەتن، ئنجا لە باسی مەرجە پەسەند و سوننەتەکان دا، کە شەش دانەن، دەڵێ: (دەوڵەتی ئیسلامیی بۆی هەیە ئەو شەش شتەبکاتە مەرج لە دەقی گرێبەستی سەرانە دا، کەلە گەڵ نامسوڵمانان دا دەبەسترێ، کە لە ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامییدا دەژین):

١- (لُبْسُ الغِيارِ وشَدُّ الزُّنّار) کاتی خۆی جۆرە بەرگێك و جۆرە پشتێنێکی تایبەتی هەبوون بەناوی (غيار) و (زُنّار) کە دەبووایە خاوەن کتێبەکان بەکاریان بێنن (المارودي) دەڵێ: مەرجە لەسەر خاوەن کتێبەکان ئەو جۆرە جل و بەرگە لەبەر بکەن و، ئەو جۆرە پشتێنە ببەستن.

٢- (أن لايَعلوا على المسلمينَ في الأبنية) نابێت خانووی ئەوان لە هی مسوڵمانان بەرزتر بێ.

٣- (ان لا يُسمِعوهم أَصوات نَواقِيسِهم وَلا تِلاوَة كُتُبِهم) وا نەکەن کە دەنگی ناقووسەکانیان (کە نەصرانییەکان یان جوولەکەکان ئەو ئامێرانە بەکاردێنن و خەڵکی خۆیانی بانگ دەکەن بۆ خواپەرستیی) وە دەنگی خوێندنەوەی کتێبەکانیشیان بە مسوڵمانان نەبیستێنن. [واتە: دەنگهەڵنەیەنن کە مسوڵمانان نە دەنگی ناقووسیان نە دەنگی خوێندنەوەی کتێبەکانیان ببیستن].

٤- (أن لا يُجاهروهم بِشُربِ خُمورِهم ولا بإظهارِ صُلبانِهم وخنازِيرِهم) نابێت بە ئاشکرا و لە بەر چاوی مسوڵمانان، شەراب بخۆنەوە، وەنابێ خاچەکانیان و

بەرازەکانیشیان پێشانی مسوڵمانان بدەن.

٥- (أَن يُخفوا دفنَ مَوتاهُم وَلا يُجاهِرُوا بنَدبٍ عليهم ولا نياحة) دەبێت شاردنەوەی مردووەکانیان بە پەنهانیی بێت، وە بە ئاشکرا پێیان دا هەڵنەدەن، وە بۆیان نەگرین (واتە: بەشێوەیەکی وا کە مسوڵمانان هەستی پێ بکەن).

٦- (وأن يُمنَعُوا من رُكوبِ الخَيلِ ولا يُمنَعُوا من ركوبِ الحَميرِوالبِغالِ) وە دەبێت ڕێگایان لێ بگیرێ کە سواری ولاخە بەرزە ببن، بەڵام ڕێیان لێ ناگیرێ کە سواری گوێدرێژ و ئێستر ببن!! دوایی هەر (الماوردي) دەڵێت: (ولا يَجوزُ ان يُحْدِثُوا فِي دارِ الإسلام بِيعَةً ولا كنيسةً وإن أحدَثوها هُدِّمَتُ عليهم)[1] واتە: وە دروست نیە کە لە نیشتمانی ئیسلام دا و لەنێو دەوڵەتی ئیسلامییدا، هیچ پەرستگایەکی جوولەکەکان و نەصرانییەکان لەنوێ دروست بکەن (بەکوردیی پەرستگای جوولەکەکان (کەنیشتە) و هی نەصرانییەکان (کڵێسا)ی پێ دەڵێن) (واتە: هی تازە نابێ دروست بکەن) وە ئەگەر دروستیشیان کرد، بەسەریان دا بڕووخێنرێ!!

بەڵام لە ڕاستییدا هەموو ئەو مەرجانە، ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ صەحیفەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) وە پێش ئەوەش بگەڕێینەوە بۆ دەقەکانی قورئان و سوننەت، شوێنەوارێکیان نابینین، ئەدی لە کوێوە هاتوون؟ لە ڕاستیدا هەموویان هەڵقوڵاوی ئەو واقیعە سیاسییەن کە مسوڵمانان تێیدا ژیاون، وە پێشم وایە بە زۆریی کاردانەوەی ئەوەبووە کە مسوڵمانان لە ژێر سایەی ئەو دەوڵەتانەی نەصرانییەکان تێیان دا باڵادەست بوون، زۆر بە خراپە مامەڵەیان لەگەڵ کراوە و، وەك کاردانەوە بۆ ستەمی ئەوان و دەستدرێژیی ئەوان بەرانبەر بەکەمینەی مسوڵمانان، هەندێك لە زانایان و شارەزایانی ئیسلامیش کەوتوونەتە ژێر کاریگەریی ئەو واقیعەوە و، ئەوانیش ئەو مەرجانەیان زیادکردوون، کە لە ڕاستییدا پێچەوانەی ڕۆحی شەریعەت و پێچەوانەی دەقەکانی قورئان و سوننەتیشن.

---

(١) الأحكام السلطانية، ص٢٣٠.

هەروەها هەر لەو ڕۆژگارەدا کۆمەڵێك بیرۆکە و هەڵوێستی وا تەبەننیی کراون کە لەگەڵ دادگەریی ئیسلام و بنەما سەرەکییەکانی دا ناگونجێن، چونکە بەو پێیە بێ، دەبێت نامسوڵمانان بەلای کەمەوە بە هاووڵاتیی پلە دوو، یان پلە سێ دابنرێن، بۆ وێنە لە کتێبە فیقهییەکان دا ئەم مەسەلانە ورووژێنراون:

**یەکەم:** هەندێك لە شەرعزانان و زانایانی ئیسلام، دەربارەی خوێنی ئەوانەی خاوەن کتێبن، یان ئەوانەی خاوەن بەڵێنن لەگەڵ مسوڵماناندا: (أهل الذمة)، ڕایان وابووە کە خوێنیان کەمتر بێت لە هی مسوڵمانان، لە حاڵێك دا کە دەبینین خوای پەروەردگار دەفەرموێ: (النفس بالنفس) المائدة -٤٤-، نەفس بە نەفس، وە هەموو دەقەکانی قورئان و سوننەت - وەك دواییش باسی دەکەین - جیاوازییان نەخستۆتە نێوان نەفسەکانەوە و تەماشای ئەوەیان نەکردوە کە ئیمانداره، یان بێ ئیمانە؟ مەگەر بێ ئیمانێکی دوژمن و جەنگاوەر بوویێت، ئەوکاتە دیارە وەك چۆن ئەو ماڵ و خوێنی مسوڵمانان بۆ خۆی حەڵاڵ دەکات، مسوڵمانانیش سەرو ماڵی ئەویان پێ حەڵاڵە.

**دووەم:** مەسەلەیکی دیکە ئەوە بووە کە ڕاجیایی لەسەر بووە: ئایا بابای (ذِمِّي) واتە: هاوپەیمان لەگەڵ مسوڵمانان دا، ڕێگا دەدرێت کە ئەرکی گشتی (الوظيفة العامه)ی پێ بسپێردرێ، بۆ وێنە: وەزیرایەتی، یان نا؟! زۆرێکیان گوتوویانە نەء، ئەم ئایەتەشیان بەبەڵگە هێناوەتەوە:

﴿... وَلَن يَجۡعَلَ ٱللَّهُ لِلۡكَٰفِرِينَ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ سَبِيلًا ١٤١﴾

واتە: خوا واینەکردوە کافران دەستەڵاتیان بەسەر ئیمانداراندا هەبێت. بەڵام بێگومان ئەگەر تەماشای سیاقی ئایەتەکە بکەین، دەبینین ئەوە پەیوەندیی بەقیامەتەوە هەیە،وەك لە تەفسیری (ابن كثير) و تەفسیرەکانی دیکەشدا هاتوە، چونکە ئایەتەکە ئاوا دەفەرموێ:

﴿... فَٱللَّهُ يَحۡكُمُ بَيۡنَكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۗ وَلَن يَجۡعَلَ ٱللَّهُ لِلۡكَٰفِرِينَ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ سَبِيلًا ١٤١﴾

واتە: خوا لە قیامەت دا دادوەرییتان لە بەین دا دەكات، وە خوا واناكات كە كافر قسەیان هەبێت بەسەر ئیمانداران دا، یاخود باڵادەست بن.

یانی: كافرەكان لە قیامەتێ بەڵگەیان بەدەستەوە نیە و ژێر ئیمانداران دەكەون لە ڕووی بەڵگە و دەلیلەوە و حوكمیان بەسەر دا دەدرێ، چونكە لەسەر ناحەقن.

كەواتە: ئەم ئایەتە هیچ پەیوەندیی بەهەڵسوكەوتی دنیاییەوە نیە.

**سێیەم:** مەسەلەیەكی دیكە ئەوەبووە كە گوتوویانە: (ذِمِّي) [هاوپەیمانێكی یان هاووڵاتییەكی نامسوڵمان] لە دەوڵەتی ئیسلامییدا مافی نیە لە هەڵبژاردنی حوكمڕان دا بەشداربێت! بەڵام تەماشای صەحیفەی مەدینە دەكەین، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: (فَلَهُ النَصرُ والأُسوة) یانی: ئەوان حەقیانە پشتیوانیی بكرێن و بەیەكسانیی مامەڵەیان لەگەڵدا بكرێ و، وەك یەك تەماشا بكرێن، كەواتە: مافی خۆیانە وەك هاووڵاتیی، دەنگ و دەستیان هەبێ لەدانانی حوكمڕان و بەرپرسانی وڵات دا.

**چوارەم:** ئایا وەك چۆن مسوڵمانێك بۆی هەیە، زەوییەكی مردوو زیندوو بكاتەوە و ببێتە خاوەنی، ئایا ئەوانیش دەبن بە خاوەنی یان نا ؟ ڕاجیاییان هەبووە، بەڵام لەڕاستییدا مادام هاووڵاتیین، بەپێی دەقەكانی قورئان و سوننەت، پێویستە ئەو مافەشیان وەك مافەكانی دیكە هەبێت.

**پێنجەم:** هەروەها ڕا جیاییان هەبووە لەوەدا كە ئایا بابای (ذِمِّي) بۆی هەیە كە ئەمان (كفالة الإِقامة) بدات بەنامسوڵمانێك كە بەشێوەیەكی كاتیی لە دەوڵەتی ئیسلامییدا نیشتەجێ بێت؟ هەندێك گوتوویانە: بۆی هەیە و هەندێك گوتوویانە: بۆی نیە، بەڵام لە ڕاستییدا ئەگەر دادگەریی و یەكسانیی بناغەی مامەڵە بێت، دەبێت وەك چۆن مسوڵمانێك بۆی هەیە، ئەویش بۆی هەبێت، دیارە دەوڵەتیش بۆی هەیە مەرج دابنێت، كە كەسێك نەبێ جاسووس یان دوژمنی مسوڵمانان بێت و زیانیان لێ بات.

**شەشەم:** مەسەلەیەکی دیکە: هەندێك لە شەرعزانان گوتوویانە: هەرکاتێك دەوڵەت پێویستیی بەخاوەن بەڵێن و پەیمانەکان (أهل الذمة) نەما کەلە دەوڵەتی ئیسلامییدان، بۆی هەیە دووریان بخاتەوە و دەریان بکات! کە لە ڕاستییدا ئەوەش زوڵمێکە و هەموو دەقەکانی قورئان و سوننەتیش باسی ئەوە دەکەن، کە نابێت زوڵم لە کەس بکرێ، چ جای لە پێکهاتەیەکی دەوڵەتی ئیسلامیی، بۆیە ئەوەش پێچەوانەی ڕووحی شەریعەت و دەقەکان قورئان و سوننەتە.

**حەوتەم و هەشتەم:** دوو مەسەلەی دیکەش ئەوەن کە: ڕێیان نەدرێ چەك هەڵبگرن، وە دەبێ لەسەرەتاوە سڵاویان لێ نەکرێ (منعهم من حَمْل السِّلاح، ومنع بدئهم بالتحية) کە ئەمانیش دیسان پێچەوانەی ئەوەن کە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: دەبێ مسوڵمانان لەگەڵیان چاکەکار و بەخشندەبن و لەگەڵیان دادگەربن، وە بەیەکسانیی مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێ.

کەواتە: ئەم بیرو ڕایانە کە ناڵێین هی هەموو زانایانن، بەڵام هەر وروژێنرانی ئەو جۆرە بۆچوونانە لە نێو شەرعزانان دا، بەڵگەی ئەوەیە کە بەڕاستیی جۆرێك لە لادان بە گشتی هەبووە لە مامەڵەکردن لەگەڵ نامسوڵمانانی ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامییدا، کە وەك گوتم: هۆکارەکەیشی زیاتر دەگەڕێتەوە بۆ ئەو دۆخە سیاسییەی کە ئەو کاتە لەئارادا بووە، وە دەگەڕێتەوە بۆ دژایەتیی کردن وپیلانگێڕیی بەشێك لە نامسوڵمانان کە لە نێو دەوڵەتی ئیسلامیی دا بوون، لە نەصرانییەکان و جوولەکەکان، ئەوانەی دیکەش، بۆیە زانایان و شارەزایان لەکاردانەوەی ئەوەدا، جۆرێك لە سەختگیریی و توندییان هەڵبژاردوە لەمامەڵەکردن لەگەڵ نامسوڵمانان دا، کە وەك گوتم: ئەو جۆرە بیربۆچوونانە هەڵقوڵاوی قورئان و سوننەت و سیرە و ڕێبازی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) و چوار جێنشینە سەرڕاستەکانی، نین و پێچەوانەیانن، ئنجا وەك پێشینان دەڵێن: ماڵی قەڵب سەر بەخاوەنیەتی!!، ئەوەش زادەی واقیعێکی نائاسایی و زادەی تێگەیشتنێکی هەڵە بووە و، جۆرێك لەلادان بووە لە ڕووحی شەریعەت و لە ڕێبازی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە بواری مامەڵەکردن لەگەڵ نامسوڵمانانێك دا، کە ویستوویانە هاووڵاتیی بن لە دەوڵەتی

ئیسلامییدا و لە ژێرسایەی دەوڵەتی ئیسلامییدا بژین، کە بە پێی ئایەتەکانی قورئان، وە بە پێی ئەو صەحیفەیەی کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) نووسیویەتی: (وەك دواییش زیاتر ڕوونی دەکەینەوە) مافی خۆیان بووە، کە لە هەموو ڕوویەکەوە لەگەڵ مسوڵمانان دا یەکسان بکرێن، وە بەو شێوەیە مامەڵەیان لەگەڵ دا بکرێ، کە مافی هاووڵاتیی بوون و دادگەریی و یەکسانیی دەیخوازن.

لێرەش دا دێینە کۆتایی ئەم بەشە و، خوا پشتیوان بێت لە بەشی داهاتوودا بەردەوام دەبین لەسەر توێژینەوەی ئەم بابەتە گرنگە، وە باسی ئەوە دەکەین کە دەوڵەتێکی ئیسلامیی پێویستە چۆن مامەڵە لەگەڵ هاووڵاتییانی نامسوڵمان دا بکات، کە دیارە برگەی چوارەم گرنگترین برگەی ئەم توێژینەوەیەی ئێمەیە، لە بارەی هەڵوێستی دەوڵەت و کۆمەڵگای ئیسلامییەوە، بەرانبەر بە نامسوڵمانان.

# بەشی چوارەم

## دەوڵەتێکی ئیسلامیی دەبێ چۆن مامەڵە لەگەڵ هاوڵاتییانی نامسوڵمان دا بکات؟!



ئایا نامسوڵمانێك كە ئەوە هەڵدەبژێرن لەژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامیی دا و لەچوارچێوەی كۆمەڵگای ئیسلامیی دا بژین، دەبێ كۆمەڵگا و دەوڵەتی ئیسلامیی چۆن چۆنی مامەڵەیان لەگەڵ دا بكەن؟!

**لەوەڵامی ئەو پرسیارە سەرەتا دەڵێین:**

**دەوڵەتێك ئیسلام بەرنامە و دەستووری بێ:**

١- ئیسلامێك ئایینی تێكڕای پێغەمبەران علیهم الصلاه والسلام بێ، ئەو پێغەمبەرانەی كە هەموویان بۆ چەسپاندنی دادگەریی هاتوون، دادگەریی و یەكسانیی (العداله والمساواة)یش دووشتی تێكهەڵكێشن و بەبێ یەكدی نابن!

٢- وە ئیسلامێك كە مرۆڤ بەگشتی بەجێنشینی خوا (خليفة الله) و بەڕێزلێگیراو و، ئاسمان و زەوی و ئەوەی نێوانیان بۆی دەستەمۆكراو، دادەنێ!

٣- وە ئیسلامێك كە ژیانی دنیا بەجێگای تێدا تاقیكرانەوەی ئازادانەی مرۆڤەكان دەزانێ و، ڕۆژی دوایی بەشوێنی وەرگرتنەوەی ئەنجامی ئەو تاقیكرانەوەیە و، بە جێگای حیساب ساغكردنەوە (تصفية الحساب) دەزانێ!

٤- وە ئیسلامێك كە سەرجەم مرۆڤایەتیی بەڕۆڵەی دایك و بابێك كە ئادەم و حەووان (عليهما السلام) دەزانێ، وە بەیەكسانیی تەماشای هەموو گەل و هۆزەكان دەكات، بەجیاوازیی ڕەنگ و زمانەكانیانەوە.

٥- وە ئیسلامێك كە كتێبەكەی و وە پێغەمبەرەكەی (موحەممەد) (صلى الله عليه وسلم) بە موڵكی هەموو بەشەر دەزانێ و، ڕووی دواندنی قورئان لە موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) هەموو مرۆڤەكانە بە بێ جیاوازیی!.

بەڵێ دەوڵەتێك كە ئیسلامێكی ئاوا بەبەرنامەی خۆی دەزانێ، ناگونجێ بەیەكسانیی تەماشای هەموو هاووڵاتییەكانی كە لەژێر سایەی دا دەژین، نەكات و، وەك یەك مامەڵەیان لەگەڵ دا نەكات، چونكە ئەگەر دەوڵەتێكی ئیسلامیی

کە ئەم ئیسلامە بەرنامەیەتی، بەیەکسانیی مامەڵە لەگەڵ هاووڵاتییەکانی دا نەکات و، وەك یەك تەماشایان نەکات.

**یەکەم:** دادگەریی بەرقەرار نابێت.

**دووەم:** ڕێز و حورمەتی مرۆڤەکان پارێزراو نابێت.

**سێیەم:** مرۆڤەکان دەرفەتی تاقیکردنەوەیەکی ئازادانەیان بۆ نارەخسێت.

**چوارەم:** ئەو یەکسانییە بەرجەستە نابێت کە خوا (سُبحانَهُ وَتَعالى) لە نێوان گەل و تیرەکان دا ڕایەگەیاندوە.

**پێنجەم:** وە مرۆڤەکانیش هەموویان کە قورئان و پێغەمبەری خاتەم ڕووی دواندنیان تێکردوون، دەرفەتی ژیانی شایستەیان چنگ ناکەوێ لەژێر سایەی ئەو دەوڵەتەدا، کە قورئان و پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) تەبەننیی دەکەن، کەواتە: دەوڵەتی ئیسلامیی دەبێ مامەڵەیەکی یەکسان و وەك یەك لەگەڵ سەرجەم هاووڵاتییانیدا بکات، بەمسوڵمان و نامسوڵمانەوە، لە هەموو ڕوویەکەوە و لەسەر بناغەی ئینتیمای هەموو لایەکیان بۆ ئەو وڵات و کۆمەڵگا و ئەو دەوڵەتە، مەگەر شتێك بەدەقێکی ڕوون و بێ چەند و چوونی قورئان و سوننەت، تایبەت کرابێ بە مسوڵمانانەوە، یاخود شتێك تایبەتکرابێ بەنامسوڵمانانەوە، ئەوە هەرکام لە پێکهاتەکانی دەوڵەت و کۆمەڵگای ئیسلامیی، پێویستە تایبەتمەندیی خۆیان بپارێزن، وە دەستدرێژیی نەکرێ بۆ سەر تایبەتمەندییەکانیان، کە دینەکەیان یاخود فیکرە و عەقیدەکەیان لێیان دەخوازێ.

ئنجا ئایا بەڵگەمان چییە بۆ ئەوەی گوتمان؟ ئێمە خوا پشتیوان بێ پێنج بەڵگە دێنینەوە بۆ ئیسپاتی ئەوە، کە پێویستە دەوڵەتی ئیسلامیی و کۆمەڵگای ئیسلامیی مامەڵەیەکی یەکسان لەنێوان پێکهاتەکانی دا بکات بە مسوڵمان و نامسوڵمانەوە، مەگەر شتێك بەبەڵگەیەك و دەقێکی ڕوون و بێ چەند و چوونی قورئان و سوننەت تایبەت کرابێت بەلایەکەوە:

**پێنج بەڵگە لەسەر ئەوە کە دەبێ دەوڵەتی ئیسلامیی مامەڵەی یەکسان لەگەڵ هاووڵاتییانی دا بکات، بە مسوڵمان و نامسوڵمانەوە:**

**بەڵگەیەی یەکەم:**

**دادگەریی بناغەی حوکمڕانییە لە ئیسلام دا و ئامانجی شەریعەتە:**

ئێمە پێشتر لەکاتی توێژینەوەی بنەماکانی سیستمی حوکمڕانیی ئیسلامییدا، بنەمایەکی سەربەخۆمان تایبەتکرد بە دادگەرییەوە و باسی دادگەریی و یەکسانییمان کرد، وە ڕوونمان کردەوە کە دادگەریی بناغەیەکی پتەوی سیستمی حوکمڕانیی ئیسلامییە، وە ئامانجی دامەزرانی خودی دەوڵەتی ئیسلامییشە، ئنجا نەك هەر ئەوەندە بگرە چەسپاندنی دادگەریی ئامانج و پاساوی ڕەوانەکرانی هەموو پێغەمبەرانی خوا ( علیهم الصلاە والسلام)، وە دابەزێندرانی سەرجەم کتێبەکانی خواشە، واتە: خوا بۆ ئەوە سەرجەم کتێبەکانی دابەزاندوە و، هەموو پێغەمبەرانی خۆی ناردوە، تاکو دادگەریی بچەسپێنن، وەك پێشتر باسمان کرد و ئێستاش دووبارەی دەکەینەوە و دەڵێین:

١- خوا عزوجل فەرموویەتی: ﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِٱلْبَيِّنَٰتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْمِيزَانَ لِيَقُومَ ٱلنَّاسُ بِٱلْقِسْطِ...﴿٢٥﴾﴾ الحدید -٢٥-.

واتە: بێگومان هەموو پێغەمبەرانمان بەبەڵگە ڕوون و ئاشکرایەکانەوە ناردوون و کتێب و تەرازووشمان لەگەڵ ناردوونە خوار، تاکو خەڵك بە دادگەریی بەڕێوە بچن.

دادگەرییش (وەك پێشتریش باسمان کردوە ) ئەگەر پێناسەیەکی کورت و سادەی بکەین دەڵێین: (العدل: الإنصاف وهو إعطاءُ المرءِ مالَهُ وَأخذُ ماعَلَيهِ)[1] واتە: دادگەریی یانی ئینصاف ئەویش بریتیە لە وە کە هەرکەسێك حەقی خۆی بدرێتێ، وە ئەوەش کە لەسەریەتی لێی وەربگیرێ.

---

(١) المعجم الوسیط، ص٥٨٨.

ئنجا ئێمە پێشتر لەکاتی توێژینەوەی بنەماکانی سیستمی حوکمڕانیی ئیسلامییدا ختستمانە ڕوو، کە دادگەریی و یەکسانیی (العدل والمساواة) دوو شتی زۆر لێك نزیکن، وە دووشتی تێکهەڵکێشن و هیچ کامیان بەبێ ئەوی دیکە نابێت، دیارە لەهەموو شتێك دا وەك یەك نین و هەندێك جیاوازییان هەن، بەڵام بەبێ یەکسانیی دادگەریی ناچەسپێت، هەروەکو یەکسانییش بەبێ دادگەریی نایەتەدی، بەڵام لە هەموو شتێکیش دا وەك یەك نین، بۆ وێنە: ئەگەر کەسێك بە دوونان نەبێ تێر نەخوات، ئەوی دیکەشیان بە لەتە نانێك تێر بخوات، دادگەریی ئەوەیە کە یەکەمیان دوو نانەکەی بدرێنێ و ئەوی دیکەش لەتە نانەکەی بدرێتێ، واتە: لێرەدا یەکسان کردنیان ستەمە، کەواتە: مەرج نیە هەرکاتێك کە یەکسانیی هەبوو، دادگەریی هەبێت، بەڵام بەزۆریی پێکەوەن، لە فەرهەنگەکانی زمانیش دا (عدل) بەمانای (مساواة) هاتوە، چونکە (مساواة) واتە: یەکسانکردنی شتەکان و وەك یەك لێکردنیان، (عدل)یش دیسان بەمانای ئەوەیە کە شتەکان وەك یەك بن و جیاوازییان پێ نەکرێ.

ئنجا با تەماشای چەند ئایەتێکی دیکەی بەپێزی قورئانی بەرێز بکەین، تاکو زۆر باش دڵنیابین کە دادگەریی بناغەی حوکمڕانیی یە لە ئیسلام دا، وە ئامانجی شەریعەتیشە،هەرچەندە پێشتریش باسمان کردوە، بەڵام ئەو ڕاستییە مەزنە تاکو جەختی لەسەر بکرێتەوە کەمە.

٢- لە سوورەتی (النحل) - ٩٠ -دا خوا (سُبحانَهُ وَتَعالى) فەرموویەتی:

﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُ بِٱلۡعَدۡلِ وَٱلۡإِحۡسَٰنِ وَإِيتَآيِٕ ذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ ...﴿٩٠﴾﴾

واتە: بێگومان خوا فەرمان دەکات بەدادگەریی و چاکەکاریی و بە بەخشین بەنزیکان، کەواتە: دادگەریی شتێکە خوا فەرمانی پێدا دەکات.

٣- لە سوورەتی (المائدة) ئایەتی - ٨ - خوا فەرموویەتی:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُونُواْ قَوَّٰمِينَ لِلَّهِ شُهَدَآءَ بِٱلۡقِسۡطِۖ وَلَا يَجۡرِمَنَّكُمۡ شَنَـَٔانُ قَوۡمٍ عَلَىٰٓ أَلَّا تَعۡدِلُواْۚ ٱعۡدِلُواْ هُوَ أَقۡرَبُ لِلتَّقۡوَىٰۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ

﴿... خَبِيرٌۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ ٨﴾

واتە: ئەی ئەوانە بڕواتان هێناوە! زۆر دادگەریی بەڕێوەبەرن، وە بۆ خوا شایەدیی بدەن (شایەدییەكی دادگەرانە) وە با ڕقهەڵسانتان لە كۆمەڵێك، واتان لێ نەكات نادادگەر بن، دادگەر بن! ئەوە لە پارێزكارییەوە نزیكترە، وە پارێز لە خوا بكەن، بێگومان خوا شارەزایە بەوەی دەیكەن.

٤- وە لە سووڕەتی (النساء) -٥٨ -دا خوا دەفەرمویَ:

﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تُؤَدُّواْ ٱلۡأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهۡلِهَا وَإِذَا حَكَمۡتُم بَيۡنَ ٱلنَّاسِ أَن تَحۡكُمُواْ بِٱلۡعَدۡلِۚ ...﴾.

واتە: بێگومان خوا فەرمناتان پێ دەكات كە سپاردەكان بگێڕنەوە بۆ خاوەنەكانیان، وە هەركاتێك لە نێوان خەڵك دا دادوەرییتان كرد، بە شێوەیەكی دادگەرانە دادوەریی بكەن.

٥- لە سووڕەتی (الشورى) - ١٥ - دا، خوا دەفەرمویَ:

﴿فَلِذَٰلِكَ فَٱدۡعُۖ وَٱسۡتَقِمۡ كَمَآ أُمِرۡتَۖ وَلَا تَتَّبِعۡ أَهۡوَآءَهُمۡۖ وَقُلۡ ءَامَنتُ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِن كِتَٰبٖۖ وَأُمِرۡتُ لِأَعۡدِلَ بَيۡنَكُمُۖ ... ١٥﴾

خوا بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمویَ: ئەوەی كە باسكرا و ڕابرد بۆ ئەوە بانگەواز بكە، وە وەك فەرمانت پێ كراوە، ڕاوەستاو بە (لەسەر شەریعەت) وە بەدوای ئارەزووەكانیان مەكەوە، وە بڵێ هەركتێبێك خوا ناردوویەتی، ئیمانم پێی هەیە (بەبێ جیاوازیی) وە فەرمانم پێ كراوە دادگەرییتان لە نێوان دا بەرپا بكەم، كەواتە: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) خوا فەرمانی پێ كردوە، كە دادگەریی بەرپا بكات لەنێوان خەڵك دا، كە لێرەدا دوێندراوەكانی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) نامسوڵمانانن و، ئەوانن كە بانگیان دەكات بۆ ئیسلام، پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) مولزەم كراوە كە دادگەرییان لە نێوان دا بەرپا بكات.

(ابن قيم الجوزية) ڕەحمەتی خوای لێ بێ، دەربارەی گرنگیی دادگەریی و ئامانج بوونی بۆ شەریعەت، کە شەریعەت بۆیە هاتوە، دادگەریی بچەسپێنێت، لە کتێبی: (الطرق الحُكْمية في السياسة الشرعية)دا هەندێك قسەی جوان دەكات كە پێشتریش لێمان خواستوونەوە و لێرەش دووبارەیان دەكەینەوە:

(فإنَّ اللهَ سُبحانهَ أرسَلَ رُسُلَهُ وَأنزَلَ كُتُبَهُ ليَقومَ الناسُ بالقسط، وَهوَ العَدل الذى قامت بِهِ الأرضُ وَالسماوات، فإن َظهَرَت أَماراتُ العدل وأسفَرَ وجهُهُ بأيِ طَريقٍ كان، فَثَمَّ شَرعُ اللهِ وَدِينهُ ... وقَد بيَّنُ سُبحانهُ بما شَرَعَهُ مِنَ الطُرُقِ، أنَّ مقصودَهُ إقامةُ العَدلِ بينَ عِبادهِ وَقيامُ الناسِ بالقسطِ، فَأيُ طَريقٍ اُستخرِجَ بِهِ العدَلُ وَالقسطُ، فهيَ مِنَ الدينِ ليسَت مُخالِفاً لَهُ)[1].

واتە: خوای پاك و بێگەرد پێغەمبەرانی خۆی ڕەوانە كردوە و، كتێبەكانی خۆی دابەزاندوە، تاكو خەڵك بە (قسط) كە ئەویش (عدل)ە [واتە: بەدادگەریی] بەڕێوە بچن، ئەو دادگەرییەی كە زەوی و ئاسمانەكان بە هۆی ئەوەوە ڕاوەستاون [خوا (سُبحانَهُ وَتَعالى) ئاسمانەكان و زەوی بەتەرازوو داناون و، بەتەرازووی دادگەریی بەڕێیانەوە دەبات] ئنجا هەركاتێك نیشانەكانی دادگەریی دەركەوتن، وە ڕووی دادگەریی دەركەوت، بەهەر ڕێیەك بێت، ئەوە دینی خوا لەوێیە، وە خوا (سُبحانَهُ وَتَعالى) ڕایگەیاندوە بەو ڕێبازانەی دەری خستوون، كە ئامانجی بریتیە لە چەسپاندنی دادگەریی لەنێوان بەندەكانی دا و، بۆ ئەوەی كە خەڵك بەدادگەریی بەڕێوە بچن، بۆیە هەر ڕێیەك و هەر شێوازێك دادگەریی پێ بهێنرێتە دەر و پێ بچەسپێنرێ، ئەوە لە ئیسلامە، وە پێچەوانەی ئیسلام نیە.

**ئنجا لێرەدا دەڵێین:**

مادام دادگەریی شتێك بێ خوا (سُبحانَهُ وَتَعالى) فەرمانی پێ كردبێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُ بِٱلۡعَدۡلِ وَٱلۡإِحۡسَٰنِ ﴾، وە خوا هەموو پێغەمبەرانی بۆ ئەو مەبەستە ناردبێ، وە لە مسوڵمانانی قەدەغە كردبێ، كە بەهۆی ڕقلێبوونەوەیانەوە بۆ كەسانێك كە نامسوڵمانن، یان دوژمنیشیانن، نادادگەریی بكەن، وە فەرمانی

---

[1] ص٣٣.

بەحوکمڕانان کردبێ کە بە دادگەرانە لە نێوان تێکڕای خەڵك دا حوکم بکەن، وە بە پێغەمبەری خاتەمی(صلی الله علیه وسلم) فەرموو بێت کە ڕایبگەیەنێت: فەرمانی پێ کراوە بەدادگەریی حوکم لە نێوان نامسوڵمانان دا بکات.

وە ڕاشمانگەیاند کە دادگەریی بەبێ یەکسانیی نایەتەدی، کەواتە: ناگونجێ دەوڵەتی ئیسلامیی مامەڵەیەکی یەکسان لەگەڵ سەرجەم هاووڵاتییان دا نەکات، خاوەنی هەر دین و هەر فیکرەیەك بن.

**وە پێویستە ئەوەش بگوترێ:**

- وەك پێشتریش باسمان کرد - کە لە صەحیفەدا نۆ (٩) جاران وشەی ( قسط) هاتوە و، جارێك وشەی (عدل) هاتوە، کە هەردووکیشیان بەمانای دادگەریین[١]، واتە دە (١٠) جاران لەو صەحیفەیەدا کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) نووسیویەتی بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ پێکهاتە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵگا و دەوڵەتی مەدینەدا، باسی دادگەریی (قسط، عدل) کراوە!



---

(١) بەڵام (قسط) زیاتر لایەنی ئابووریىء ماددیی دەگرێتەوە (عدل)یش لایەنی مەعنەوییی.

**بەڵگەی دووەم :**

**پاراستنی حورمەت و ڕێزی مرۆڤەکان، گەورەترین بەها و سەرەکییترین مافە و، دەبێ بۆ یەك یەکی مرۆڤەکان دابینبکرێ:**

بەڵێ مرۆڤێك خەلیفەی خوا بێ، وەك فەرموویەتی:

﴿إِنِّي جَاعِلٌ فِي ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً...﴿٣٠﴾﴾ البقرة -٣٠-.

وە خوا ڕێزی لێنابێ، وەك دەفەرموێ:

﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِيٓ ءَادَمَ ...﴿٧٠﴾﴾ الإسراء-٧٠-.

وە هەڵگری سپاردەی خوا بێت، وەك دەفەرموێ:

﴿...وَحَمَلَهَا ٱلْإِنسَٰنُ...﴿٧٢﴾﴾ الأحزاب -٧٢-.

وە لە چاکترین شێوە دا دروستکرا بێ:

﴿لَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ فِيٓ أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ ﴿٤﴾﴾ التين-٤-.

مرۆڤێکی ئاوا، دەبێ بەمانای وشە ڕێزی لێ بگیرێ و، حورمەت و کەسایەتیی بپارێزرێ، کە دیارە ئەمەش بەبێ دەستەبەرکردنی سەرجەم ماف و ئازادییەکان مسۆگەر نابێت.

کەواتە: ماف و ئازادییە کەسییەکان و فیکرییەکان و کۆمەڵایەتییەکان و ئابوورییەکان و سیاسییەکان، ( کەکاتی خۆی لە دەمی توێژینەوەی سیستمی حوکمڕانیی ئیسلامییدا بە تەفصیلْ باسمان کردن) پێویستە هەموو ئەوانە بۆ هەموو پێکهاتەکانی دەوڵەتی ئیسلامیی دەستەبەر و دابین بکرێن.

ئنجا لێرەدا ڕەنگە ئیشکالێك و پرسیارێك لەدەلاقەی زەینی هەندێك کەس دا سەرەتاتکە بکات و بڵێت: باشە چۆن دەگونجێ ڕێز لە کافرێك بگیرێ، با

هاووڵاتییش بێ لە دەوڵەتی ئیسلامییدا، کە بڕوای بە ئیسلام نیە و بڕوای بە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) نیە و بڕوای بە قورئان نیە، وە چەندان ئایەتمان هەن کە خوای پەروەردگار تێیاندا دەفەرموێ: کافرەکان خراپترین ژیاندارن و، لە ئاژەڵ خراپترن و زۆر زەمیان دەکات؟

**بۆ وێنە:** خوا دەفەرموێ:

﴿إِنَّ شَرَّ ٱلدَّوَآبِّ عِندَ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ٥٥﴾ الأنفال -٥٥-.

واتە: بێگومان خراپترینی زیندەوەران لەلای خوا، ئەوانەن کە بێ بڕوان، چونکە ئیمان ناهێنن.

وە لەسوورەتی ( الأعراف) - ١٧٩ - دا دەفەرموێ:

﴿وَلَقَدۡ ذَرَأۡنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِۖ لَهُمۡ قُلُوبٞ لَّا يَفۡقَهُونَ بِهَا وَلَهُمۡ أَعۡيُنٞ لَّا يُبۡصِرُونَ بِهَا وَلَهُمۡ ءَاذَانٞ لَّا يَسۡمَعُونَ بِهَآۚ أُوْلَٰٓئِكَ كَٱلۡأَنۡعَٰمِ بَلۡ هُمۡ أَضَلُّۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡغَٰفِلُونَ ١٧٩﴾

واتە: بێگومان ئێمە زۆرێك لە جند و مرۆڤمان بۆ دۆزەخ داناون، کە دڵ و عەقڵیان هەن، پێیان تێناگەن، چاویان هەن پێیان نابینن، گوێیان هەن پێیان نابیستن، ئەوانە وەك ئاژەڵن، بەڵکو لە ئاژەڵیش گومڕاترن، ئەوانە بێ ئاگان.

واتە: خوای کاربەجێ ئاوا بە خراپیی باسی کافران دەکات، ئەدی چۆن لە دەوڵەتی ئیسلامییدا بەیەکسانیی لەگەڵ مسوڵمانان دا مامەڵەیان لەگەڵ دا بکرێ، بۆ ئەوەی ئەوڕێز و حورمەتەی خوا فەرموویەتی کەلە ئینسانەکانی ناوە، بێتە دی ؟ وەڵامەکەی ئەوەیە کە: ئێمە دەبێ ئایەتەکانی قورئان هەروەها فەرمایشتەکانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هەرکامیان لە شوێنی خۆی دا بنێین، وەك گوتراوە: (لكلِّ مقامٍ مقال) هەرشوێنە قسەی خۆی دەوێ، ئەگەرنا ئەگەر بێت و بە سادەیی و سەرکێڵیی تەماشای ئایەت و فەرمایشتەکان بکەین، وا گومان دەبەین کە تێك دەگیرێن و دژ بەیەکدی دەوەستنەوە، بەڵام

خوای پەوەردگار فەرمووبەتی:

﴿...وَلَوْ كَانَ مِنْ عِندِ غَيْرِ ٱللَّهِ لَوَجَدُوا۟ فِيهِ ٱخْتِلَٰفًا كَثِيرًا ﴿٨٢﴾﴾ النساء -٨٢-.

واتە: وە ئەگەر قورئان لە لای جگەلە خواوە هاتبایە، ناکۆکیی زۆریان تێدا دەبینی.

هیچ کەسێك نیە هەندێك لە قسەکانی تێك نەگیرێن، بەڵام فەرمایشتەکانی خوا تێك ناگیرێن، بەڵام چۆن تێك ناگیرێن؟ بەوەکە هەر فەرمایشتە لە شوێنی خۆی دا دابنێی، لێرەدا بەکورتیی دەڵێین: ڕێزلێگیرانی مرۆڤەکان بە گشتی بە مسوڵمان و کافرەوە، وە بەسووك سەیرکرانی کافران بە تایبەت، دوو حاڵەتی جیا و بە دوو ئیعتیباری جیاوازن: لە لایەکەوە کە خوا دەفەرمویێ: مرۆڤەکان دەبێت ڕێزیان لێ بگیرێ، ئەوە بەئیعتیبارێکە، لەو لاوەش کە دەفەرمویێ: کافرەکان خراپترین زیندەوەرن، ئەوە بە ئیعتیبارێکی دیکەیە. بەم شێوەیە: لەو ڕووە وە کە خوا جند و ئینسانی دروستکردوون، تاکو تاقییان بکاتەوە، پێویستییان بە ژیانێك هەیە کە تێیدا بژین، ژیانێکی ڕێز لێگیراوانە، ژیانێکی ئازادانە، وە خوا سەرپشکی کردوون و ئازادی کردوون، لەو ژیانە دنیاییەدا، لەنێوان ئیمان و کوفردا، بۆیە پێویستە هەموویان ڕێز و حورمەتیان و کەسایەتییان پارێزراو بێ، بەڵام بێ بڕوایان بە ئیعتیباری قیامەت و بۆ لای خوا و لە دواڕۆژ دا، سووك و ڕیسوان و، بەکەم تەماشا دەکرێن، ئەوە لە لایەك، لە لایەکی دیکەوە: ئەگەر تەماشای ئەو دەقانەی قورئان بکەین کە زەمی کافرەکان دەکەن، هەموویان لەو حاڵەتان و مەبەست ئەو کافرانەن، کە دژی ئیسلام و مسوڵمانانن و، سەنگەریان لێ گرتوون و شەڕیان پێ دەفرۆشن و، دەستدرێژییان دەکەنە سەر و، ڕێی دینداریيان لێ دەگرن، کەواتە: لە لایەکەوە کە خوای دادگەر بەگشتی و بۆسەرجەم مرۆڤەکان دەفەرمویێ: ئینسان جێنشینی خوایە و، ڕێزم لە ئادەمزاد گرتوە و، ئینسانم لە باشترین شێوەدا خولقاندوە و، ئینسانم ئازاد و سەرپشك کردوە، ئیمان دێنێت یان ئیمان ناهێنێت، ئەوە لە شوێنی خۆی، وە لەولاوەش: کە زەمی کافران دەکات، ئەوە بۆ حاڵەتی ڕۆژی دواییە و لەو ڕووەوەیە کە خوا سزایان دەدات و، لە تەرازووی خوادا بەوشێوەیەن.

**ئنجا ئایا بەڵگەمان چییە لەو بارەوە؟!**[1] **شەش جۆرە بەڵگە دێنینەوە:**

**یەکەم:** گشتیی بوونی تەعبیرەکان: ﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِيٓ ءَادَمَ ...﴿٧٠﴾﴾، ﴿لَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ فِيٓ أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ ﴿٤﴾﴾، ﴿إِنِّي جَاعِلٌ فِي ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً...﴿٣٠﴾﴾، ﴿...وَحَمَلَهَا ٱلْإِنسَٰنُ...﴿٧٢﴾﴾، وەك دەبینین، ئەو تەعبیرانە هەموویان گشتیین و خوا بە گشتیی دەفەرمویَ: ڕێزمان لە وەچەی ئادەم گرتوە و، بە گشتیی دەفەرمویَ: ئینسانمان لە باشترین شێوە دا دروستکردوە و، بە گشتیی دەفەرمویَ: دەمەویَ جێنشینێك لە سەر زەویدا دابنێم و، بە گشتیی دەفەرمویَ: ئینسان سپاردەی خوای هەڵگرت.

**دووەم:** ئەو ئایەتانەی کە زەمی کافرەکان دەکەن، خوای پەروەردگار تایبەتی کردوون، بەلای خۆیەوە، یاخود بە قیامەتەوە، بۆ وێنە:

﴿إِنَّ شَرَّ ٱلدَّوَآبِّ عِندَ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٥٥﴾﴾ الأنفال -٥٥-.

خراپترین زیندەوەر لە لای خوا هەروەها بەپێچەوانەوە بە نسبەت تەقواوەش:

﴿...إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ...﴿١٣﴾﴾ الحجرات -١٣-.

بێگومان بەڕێزترینتان لەلای خوا پارێزکارترینتانن. کەواتە: کەس بۆی نیە بڵێ: من لە خەڵکی دیکە بەتەقواترم و خۆی هەڵکێشێ!

**سێیەم:** خوای کاربەجێ لەباسی ڕۆژی دوایی و قیامەت دا زەمی کافران دەکات و، بەخراپتر لەئاژەڵ وەسفیان دەکات:

﴿وَلَقَدْ ذَرَأْنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيرًا مِّنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ ... ﴿١٧٩﴾﴾ الأعراف -١٧٩-.

**چوارەم:** ئایەتەکەی سووڕەتی (الإسراء) کە دەفەرمویَ:

﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِيٓ ءَادَمَ وَحَمَلْنَٰهُمْ فِي ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ وَرَزَقْنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَفَضَّلْنَٰهُمْ عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلًا ﴿٧٠﴾﴾

---

(١) واتە: کە پێویستی ڕێزءکەسایەتیی هەموو مرۆڤەکان پارێزراو بێ.

کە ئەمەش بۆ هەموو مرۆڤەکانە بێ جیاوازیی:

١- جارێ کە دەفەرموێ: ڕێزمان لەوەچەی ئادەم گرتوە، دیارە وشەی (بنی آدم) هەموویان دەگرێتەوە.

٢- ئنجا ئەوەی دیکە کە دەفەرموێ: لە وشکانیی و لە دەریادا هەڵمان گرتوون.

٣- وە لەڕۆزییە خۆش و بەسوودەکان پێمان داون.

٤- وە بەسەر دروستکراوەکانمان دا هەڵمان بژاردوون، دیارە: کافر و مسوڵمان بە وشکانیی و بە دەریادا دەڕۆن، وە کافرو مسوڵمان بەهرەمەندن لە ڕزقە بەلەززەتەکان، وە ئینسان لە هەموو دروستکراوەکانی خوای پەروەردگار باڵاترە، ئنجا کافرە یان مسوڵمانە، چونکە ئینسان ژیار پێك دێنێ و، شارستانێتیی دروست دەکات و، دەوڵەت بنیات دەنێ و بەرەو پێشدەچێت، بەڵام ژیاندارەکانی دیکە هەر لە شوێنی خۆیانن، کەواتە: ڕێز لێگرتنەکەش گشتییە.

**پێنجەم:** پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەبەر جەنازەی جوولەکەیەك دا هەڵساوە و کاتێك بەسەرسوڕمانەوە لێی پرساوە: کە چۆن لەبەری هەڵساوە،لەحاڵێك دا کەهی جوولەکەیە؟! فەرموویەتی: (أَليست نفساً)؟! ئەدی مرۆڤ نیە؟ وەك لەم فەرمایشتەدا هاتوە:

{إِنَّ النَّبيَّ (صلى الله عليه وسلم) مَرَّتْ بِهِ جَنازَةٌ، فقامَ، فَقيلَ لهُ: إنَّها جِنازَةُ يَهوديٍّ؟ فقالَ: أَليسَت نَفْسَاً} (رَوَاهُ البُخَارِي برقم: (١٣١٢).

واتە: جەنازەیەك بەلای پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) ڕابرد، ئەویش لەبەری هەڵسا، گوتیان: ئەوە تەرمی جوولەکەیەکە! فەرمووی: ئایا نەفس نیە؟ کەواتە: لە دنیادا نەفسی بەشەر جوولەکە بێ، نەصرانیی بێ، مسوڵمان بێ، هەرچی بێ، دەبێ ڕێزی لێ بگیرێ، چونکە خوای پەروەردگار ڕێزی لێناوە:

﴿ وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِيٓ ءَادَمَ ... ﴾ الإسراء -٧٠-.

کەواتە: بێڕێزییەکەی کافران بۆقیامەتە، کە سزای خۆیان وەردەگرنەوە و، لەوێ تەصفیە حیساب دەکرێ.

**شەشەم:** ئەو ئایەتانەی کە باسی زەمی کافران دەکەن، سیاقی ئایەتەکان دیاریی دەکات، کە ئەوانە دوژمنانی ئیسلامن و لەدژی لەحاڵەتی جەنگ دان، تەنیا یەك نموونە دێنینەوە: خوا دەفەرمویٚ:

﴿ كَدَأْبِ ءَالِ فِرْعَوْنَ وَٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِ رَبِّهِمْ فَأَهْلَكْنَـٰهُم بِذُنُوبِهِمْ وَأَغْرَقْنَآ ءَالَ فِرْعَوْنَ وَكُلٌّ كَانُوا۟ ظَـٰلِمِينَ ﴿٥٤﴾ إِنَّ شَرَّ ٱلدَّوَآبِّ عِندَ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٥٥﴾ ٱلَّذِينَ عَـٰهَدتَّ مِنْهُمْ ثُمَّ يَنقُضُونَ عَهْدَهُمْ فِى كُلِّ مَرَّةٍ وَهُمْ لَا يَتَّقُونَ ﴿٥٦﴾ فَإِمَّا تَثْقَفَنَّهُمْ فِى ٱلْحَرْبِ فَشَرِّدْ بِهِم مَّنْ خَلْفَهُمْ لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ ﴿٥٧﴾ ﴾

خوای پەروەردگار باسی دارو دەستەی فیرعەون دەکات، وە باسی ئەوانەی پێش وان دەکات کە ئایەتەکانی خوایان بەدرۆزانیون و خواش بەهۆی گوناهەکانیانەوە فەوتاندوونی و دارودەستەی فیرعەونی لەئاودا خنکاندوە، وە دەفەرمویٚ: هەموویان ستەمکاربوون، ئنجا دوایی دەفەرمویٚ: بێگومان خراپترین زیندەوەر لە لای خوا ئەوانەن کە بیٚ بڕوان، چونکە ئیمان ناهێنن، ئەوانەی کە پەیمانتان لەگەڵ بەستوون، پاشان هەموو جارێك پەیمانەکە هەڵدەوەشێننەوە (هەر دەرفەتێکیان دەست کەوت، پەیمان هەڵدەوەشێننەوە و، زەبر لە مسوڵمانان دەدەن) وە پارێز ناکەن. ئەوانە هەرکاتێك لە جەنگ دا زەفەرت پیٚ بردن، بە شێوەیەك زەبریان لیٚ بدە، کە ئەوانەی دواییشیان پێی تەمبیٚ بن، (بەڵام دوای ئەوەی کە ئاگاداریان دەکەیەوە، کە پەیمانیان لەگەڵ مسوڵمانان دا نەماوە).

کەواتە: بەبیٚ ڕێزلێگرتنی مرۆڤەکان و، پاراستنی حورمەت و کەسایەتییان، ئەوەی کە خوا فەرموویەتی، نایەتە دی، بۆیە پێویستە دەوڵەتی ئیسلامیی مامەڵەیەکی یەکسان لەگەڵ هەموو هاووڵاتییانی دا بکات، چونکە بەبیٚ مامەڵەی یەکسان و دادگەرانە، ڕێز و حورمەتی ئینسانەکان ناپارێزرێت، ئنجا کەڕێز و حورمەتی مرۆڤەکانیش نەپارێزرا، مانای وایە ئەو فەرمانانەی خوا و پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) جیٚ بەجیٚ نەکراون.

**بەڵگەی سێیەم:**

**هاووڵاتیی بوونی نامسوڵمانان، ئەوە دەخوازێ کە مامەڵەی یەکسانیان لەگەڵ دا بکرێ:**

مادام نامسوڵمانان هاووڵاتیین لە دەوڵەتی ئیسلامیی دا، ئەمە ئەوە دەخوازێ کە وەك یەك مامەڵەیان لەگەڵ دا بکرێ، مەگەر ئەوەی وەك گوتمان، بەبەڵگەیەکی شەرعیی جیاکرابێتەوە و تایبەتکرابێت بە لایەکیانەوە.

جارێ با پێناسەی هاووڵاتێتیی (المواطنة) بکەین، یانی چی؟ هاووڵاتێتی بەم جۆرە پێناسەکراوە: (المواطَنَةُ: رابِطَةٌ سياسيةٌ وَ قانونيةٌ بينَ شخصٍ ودَولَةٍ مُعَيَنَةٍ تجَعَلُهُ عُضواً فيها، وَ تُفيدُ آنتِماءَهُ إليها وَتَجعَلُهُ في حالَةِ تَبَعِيَّةٍ سياسيةٍ لَها)[1].

واتە: هاووڵاتێتیی بریتیە لە پەیوەندییەکی سیاسی و یاسایی لە نێوان کەسێك و دەوڵەتێکی دیاریی کراو دا، کە ئەو پەیوەندییە سیاسی و یاساییە، وای لێ دەکات سەر بەو دەوڵەتە بێت و وای لێ دەکات لە ڕووی سیاسییەوە، ملکەچی ئەو دەوڵەتە بێت و شوێنکەوتووی بێ.

دیارە ئینتیمای ئینسان بۆ نیشتمانی، بۆ دەوڵەتی، بۆ ئەو قەوارەیەی کە تێیدا نیشتەجێیە، شتێکی سروشتییە، واتە: شتێکە پەیوەندیی بە سروشتی بەشەرەکانەوە هەیە، بەشەرەکان حەز بەسەربەخۆبوونی خۆیان دەکەن، حەز بە دەوڵەتی خۆیان و نیشتمان و قەوارەی خۆیان دەکەن، کە لەژێر سایەی دا بژین، بەڵگەمان چییە؟

**دەتوانین پێنج بەڵگان لەوبارەوە بێنینەوە:**

١- ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دوای ئەوەی لە مەککە دەرکرا، ئاوڕی لە مەککە

---

(١) التشريعُ الجِنائي، لعبدالقادر عودة، ج١ص٣٠٧.

دایەوە و فەرمووی:

{مَا أَطْيَبَكِ مِنْ بَلَدٍ وَأَحَبَّكِ إِلَيَّ وَلَوْلَا أَنَّ قَوْمِي أَخْرَجُونِي مِنْكِ مَا سَكَنْتُ غَيْرَكِ}
(رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ برقم: (٣٩٢٦)، عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ، وَقَالَ هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ، قال الشيخ الألباني: صحيح).

واتە: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ڕووی لە مەککە کردو فەرمووی: چەند نیشتمانێکی خۆشی! وە چەندە لەلام خۆشەویستی! وە ئەگەر گەلەکەم منیان لە تۆ وەدەرنەنابایە، لە غەیری تۆدا دانەدەنیشتم (واتە: تۆم بەجێ نەدەهێشت).

٢- هەروەها پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بەرانبەر بە مەدینە، دوای ئەوەی تێیدا بۆتە هاوولاتییەك و، بۆی بۆتە نشینگە، فەرموویەتی:

{اللّهُمَّ حَبِّبْ إِلَيْنَا الْمَدِينَةَ كَمَا حَبَّبْتَ إِلَيْنَا مَكَّةَ أَوْ أَشَدَّ} (أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢٤٣٣٣)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (١٧٩٠)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١٣٧٦)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٣٧٢٤) .

واتە: ئەی خوایە! مەدینەمان لەلاخۆشەویست بکە وەك خۆشەویستییمان بۆ مەککە، یاخود زیاتریش. یانی: مەککەمان زۆر خۆش ویستوە، وامان لێ بکە کە مەدینەشمان لەلا خۆشەویست بێ، چونکە ئەویش وڵات و نیشتمانی خۆمانە.

٣- پاشان لە سوورەتی (الحج) -٣٩ و ٤٠ - دا، خوا (سُبحانَهُ وَتَعالى) باس دەکات کە جەنگ و جیهاد مۆڵەتە بۆ کەسانێك کە لە ماڵ و حاڵ و نیشتمانی خۆیان وەدەر دەنرێن:

﴿أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَـٰتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا۟ ۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ ﴿٣٩﴾ ٱلَّذِينَ أُخْرِجُوا۟ مِن دِيَـٰرِهِم بِغَيْرِ حَقٍّ ... ﴿٤٠﴾﴾

واتە: مۆڵەتە بۆ کەسانێك کە جەنگیان لەدژ دەکرێ و ستەمیان لێ کراوە، وە بێگومان خوا لەسەر سەرخستنیان بە توانایە، کەسانێك کە لە ماڵ وحاڵ

و نیشتمانی خۆیان بەناحەق دەردەکرێن، کەواتە: کاتێك ئینسان بە ناحەق لە نیشتمانی خۆی دەردەکرێ، خوا مۆڵەتی پێداوە کە جەنگ بکات و، دوژمنە داگیرکەرەکانی وڵاتەکەی و نیشتمانی خۆی دەر بکات، یاخود ئەگەر دەرکرابێ، وا بکات کە بچێتەوە و بگەڕێتەوە وڵات و زێدی خۆی.

٤- هەروەها لە سوورەتی (البقرة) - **٢٤٦** -دا لە بەسەرهاتی تاڵووت دا، دوای ئەوەی ئەو پێغەمبەرە ( علیه السلام ) کە خوا لە دوای مووسا (علیه السلام) ڕەوانی کرد و، دوایی خوا تاڵووتی بۆ کردن بە فەرماندە، پێغەمبەرەکەیان (علیه السلام) دوای ئەوەی پێیان دەڵێت: ئایا ئامادەن جەنگ بکەن، ڕەنگە ئەگەر لەسەرتان فەرزکرا، نەیکەن؟! خەڵکەکە دەڵێن:

﴿ ...قَالُواْ وَمَا لَنَآ أَلَّا نُقَٰتِلَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَقَدۡ أُخۡرِجۡنَا مِن دِيَٰرِنَا وَأَبۡنَآئِنَا ... ﴿٢٤٦﴾ ﴾

واتە: بۆچی لە ڕێی خوادا، جەنگ و جیهاد ناکەین، لە حاڵێك دا کە لە نیشتمانی خۆمان و لە نێو ڕۆڵە و وەچەکانی خۆمان وەدەرنراوین؟!، کەواتە: کەسێك کە ئەو زوڵمەی لێ بکرێ، لە نیشتمانی خۆی وەدەر بنرێ، حەقی خۆیەتی کە بجەنگێ لە پێناوی خوادا تاکو ئەو زوڵمە لەسەر خۆی لادەبات.

٥- هەروەها پێغەمبەری خوا (صلى الله علیه وسلم) لە فەرموودەیەك دا دەفەرموێ:

{مَنْ قُتِلَ دُونَ مَالِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ، وَمَنْ قتِلَ دُونَ دِينِه فَهُوَ شَهِيدٌ، وَمَنْ قُتِلَ دُونَ دَمِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ، وَمَنْ قُتِلَ دُونَ أَهْلِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ} (رَوَاهُ أَحْمَد برقم: (١٦٥٢)، وَأَبُودَاوُدَ برقم: (٤٧٧٢)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١٤٢١)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٤٠٩١)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٢٥٨٠)، قال الشيخ الألباني: صحيح).

واتە: هەرکەسێ لەسەر ماڵی بکوژرێ، شەهیدە، وە هەرکەسێك لەسەر دینی بکوژرێ، شەهیدە، وە هەرکەسێك لەسەر خوێنی بکوژرێ، شەهیدە، وە هەرکەسێك لەسەر کەس وکاری بکوژرێ، ( یانی: لەسەر خەڵکەکەی بکوژرێ، کە هەم

ماڵ و خێزان دەگرێتەوە و، هەم کەس و کارو خزمان دەگرێتەوە و هەم هاووڵاتییان و هاونیشتمانییان دەگرێتەوە)، شەهیدە.

ئنجا پێویستە بزانرێ کە لە زاراوەی ئیسلامییدا لە جێی وشەی: ( وطن) وشەی: (دار) بەکارهاتوە: (أهلُ الوَطَن: أهلُ الدار)، وە لە کتێبە فیقهییەکان دا شەرعزانان کە گووتویانە: (أهل الدار) یانی: (المواطن) هاووڵاتیی، ئەوەی کە لە وڵاتێك دا لە گەڵمان دا دەژی.

وە ئەگەر تەماشای صەحیفەی مەدینە بکەینەوە، دەبینین لەچەند بەندێکی دا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)باسی پەیوەندیی هاووڵاتیی و هاونیشتمانێتی کردوە، بۆ نموونە:

١- لە بەندی (٣٩) دا دەفەرموێ: ( وَأنّ يَثربَ حرامٌ جوفُها لِأهلِ هذهِ الصحيفة ) واتە: نێو یەسریب قەدەغەیە لە هەمو ئەوانەی کە ئەم سەحیفەیان ئیمزا کردوە، نابێ شتێکی تێدا بکەن پێچەوانەی بەرژەوەندیی و هێمنیی و ئاسایش بێ.

٢- لە بەندی (٤٤)دا دەفەرموێ: ( وَ أنَّ بينهُم النَّصرُ على مَن دَهَم يَثْرِبَ ) واتە: وە پێکهاتەکانی دەوڵەت لە نێو خۆیان دا، پێویستە پشتی یەکدی بگرن، لە دژی هەر کەسێك کە هێرش دەکاتە سەر یەسریب.

٣- لە بەندی (٤٧) دا دەفەرموێ: ( وَانهُ مَنْ خَرَجَ آمن، وَمَن قَعَدَ آمنٌ بالمدينة، الاّ مَن ظَلَمَ وَأَثِمَ) واتە: وە هەرکەسێك لە مەدینە بچێتە دەرێ، وە هەرکەسێك تێیدا دابنیشێ، پێویستە هێمنیی و ئاساییشی بۆ دەستەبەر بکرێ، مەگەر کەسێك ستەم و گوناه بکات، کەواتە: هاووڵاتیی بوون و هاونیشتمانیی بوون، ئەرك و مافێکە، کە ئیسلام بۆ سەرجەم هاووڵاتییانی دابین دەکات، بێ جیاوازیی: جوولەکەیە، نەصرانییە، زەردەشتییە، موونافیقە، کافرە، مادام لە دەوڵەتی ئیسلامییدایە، هاووڵاتییە، لەگەڵ هاووڵاتییانی دیکە دا، کە مسوڵمانن پێویستە وەك یەك مامەڵەیان لەگەڵ دا بکرێ، چونکە هەموویان هاووڵاتیی (أهل الدار)ن و هەموویان لەو نیشتمانەدا دەژین.

**بەڵگەی چوارەم:**

**پەیمان و گرێبەستی نێوان دەوڵەتی ئیسلامیی و هاووڵاتییانی نامسوڵمان، مامەڵەی یەکسان لەگەڵیان دا دەخوازێ:**

ئایا لەسەر چ بنەمایەك هاووڵاتییانی نامسوڵمان لەدەوڵەتی ئیسلامییدا دەژین؟ بێگومان لەسەر بنەمای گرێبەست (عقد)ێك کە بریتیە لە وەی: ئێمە ئامادەین هاووڵاتیی بین لە ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامییدا، وە ئەندامێك بین لە کۆمەڵگای ئیسلامییدا.

ئنجا ئەو پەیمان و گرێبەستە، ئەوە دەخوازێ کە پێویستە مامەڵەی یەکسان لەگەڵ ئەو هاوپەیمانانە دا، کە بەحوکمی ئەو گرێبەستە لەگەڵ مسوڵمانان دا لە ژێر سایەی ئەو دەوڵەتە دا دەژین، بۆیە شەرعزانان وشەیەکیان بەکارهێناوە، کە دیارە ئەو وشەیە لە هەندێك فەرمایشتی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دا هاتوە، بەڵام بەزۆریی شەرعزانان بەکاریان هێناوە: (أهل الذِّمَّة)، ئنجا ئایا ئەمە یانی چی ؟ یانی: پەیمانداران، بەڵێنداران، ئەوانەی کە پەیمان و بەڵێنیان لەگەڵ دەوڵەتی ئیسلامییدا هەیە.

بەڵگەش لەسەر ئەوەی گوترا - کە گرێبەست و پەیمانی نێوان دەوڵەتی ئیسلامیی و هاووڵاتییانی نامسوڵمان، خوازیاری مامەڵەی یەکسانە- چەند شتێکە:

١- زانایانی ئیسلام لەبارەی نامسوڵمانانی پەیماندار (أهل الذِّمَّة)ەوە، وەك بنچینەیەك گوتوویانە: (لَهم مالنا وَعليهم ماعلينا ) ئەم بنچینەیە لە هەمووکتێبە فیقهییەکان دا هاتوە، بۆ وێنە: (آثارالحرب)ی (د. وهبة الزحيلي)[1]، واتە: ئەوان هەمان مافیان هەیە کە ئێمە هەمانە، وە هەمان ئەرکیان لەسەر شانە کە ئێمە لەسەرشانمانە، واتە: نامسوڵمانان لە ئەرك و مافەکان لەگەڵ مسوڵمانان دا یەکسانن، مەگەر ئەرك و مافێك بەبەڵگەیەکی شەرعیی تایبەت کرابێت بە

---

(١) ص ٩٤٩.

مسوڵمانانەوە، یاخود بە نامسوڵمانانەوە.

٢- بەڵگەیەکی دیکە (علی بن أبی طالب) خوا لیی رازی بێت گوتوویەتی: ( وَإنَّما بَذَلُوا الجِزيةَ لِتَكونَ أموالُهم كأموالنا وَ دِماؤُهم كَدِمائنا) واتە: خاوەن بەڵێن و پەیمانەکان بۆیە سەرانە دەدەن، تاکو ماڵیان وەك ماڵمان بێت و خوێنیان وەك خوێنمان بێت. واتە: لەگەڵمان دا یەکسان بن، دیسان لە زۆربەی کتێبە شەرعییەکان دا ئەم قسەیەی (علی) خوا لێی رازی بێ کە وەك بنچینەیەکی شەرعیی زانایان تەبەننییان کردوە، ئاماژەی پێدراوە.

٣- بەڵگەیەکی دیکەش ئەوەیە کە تەماشای چەند پەیماننامایەك بکەین کە لەنێوان دەوڵەتی ئیسلامیی و چەند پێکهاتەیەکی نامسوڵمانی دا ئیمزاکراون:

**یەکەم:** لە ژێر ناو ونیشانی: (معاهَدَتهُ صلی الله علیه وسلم معَ نصاری نجران ) دا ئەم دەقە هاتوە کە:

ئێمە تەنیا ئەوەی مەبەستمانە دەینووسین (بسمِ الله الرحمن الرحیم هذا ما كَتَبَ محَمَدٌ النبيُّ رسولُ اللهِ (صلی الله علیه وسلم) لأهلِ نجران: وِلنجرانَ وَحاشيَتها جِوارُاللهِ وَذمَةُ محمدٍ النبيِّ رسولَ الله على أموالِهم وأنفسِهم وَمِلَّتِهم وَغائبِهم وَ شاهِدهم و عشِيرَتِهم وَبِيَعِهم وَ كُلِ ما تحتَ أيديهم من قليلِ أو كثير، لا يُغيَّرُ أُسقُفٌ مِن أُسقُفيَّته وَلا راهِبٍ من رهبانِّيتَّةٍ ولا كاهِنٍ من كهانته وليسَ عليهم رُبِّيَّةٌ وَلا دَمُ جاهِليةِ، وَلا يُحْشَرونَ ولا يُعْشَرون، ولا يَطأُ أرضَهم جيشٌ وَمَن سَألَ منهم حقاً فَبينَهُم النَّصَفُ غيرُ ظالمِينَ وَلا مظلومين.. )[1].

واتە: بەناوی خوای بەبەزەیی بەخشندە، ئەمە ئەوەیە کە موحەممەد پێغەمبەرو ڕەوانە کراوی خوا (صلی الله علیه وسلم) بۆ خەڵکی نەجرانی نووسی: (کە نەصرانیی بوون) وە بۆ خەڵکی نەجران و ئەوانەی کە لە گەڵیانن پەیمانی خوا و بەڵێنی موحەممەد ڕەوانەکراوو پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هەیە، لەسە ر ماڵیان و نەفسیان و دینیان، وە ئەوەیان کە لێرە نیە و ئەوەیان کە لێرەیە،

---

(١) مجموعة الوثائق السیاسیة، الوثیقة: ٩٤، ص١٧٥، ١٧٦.

وە لەسەر هۆزیان و پەرستگاكانیان، وە هەرچی كەلە ژێر دەستیان دایە، لە زۆر و لە كەم [كە هەمووی دەبێت پارێزرا و بێت] هیچ ئوسقوفێك لە ئوسقوفییەتی لانابرێت (كە دیارە ئوسقوف پلەیەكی زانایەتیی نەصرانییەكانە) وە هیچ ڕاهیبێك لە ڕەهبانییەتی خۆی لاناچێت، وە هیچ كاهینێك لە كەهانەتی خۆی لا ناچێت (ئەوانە هەموویان نازناون بۆ زاناكانی جوولەكە و نەصرانیی) وە سوود و خوێنی سەردەمی نەفامێتیی یان لەسە ر حیساب ناكرێت، وە بەزۆر لە شوێنێك دا خڕناكرێتەوە، وە هەروەها دەیەكیان لێوەرناگیرێ، وە هیچ سوپایەك ناچێتە سەرزەمینەكەیان، وە هەر كەسێكیان داوای مافێكی كرد، پێویستە دادگەرانە مامەڵەیان لەگەڵ دا بكرێ، نە ستەم بكەن و نەستەمیشیان لێ بكرێ.

**دووەم:** پەیماننامەیەكی دیكەش لە نێوان پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و هۆزی (ثقیف)دا بووە لە تائیف، بەپێی ئەو پەیماننامەیەش، دەبێت مامەڵەی یەكسان لەگەڵ هاووڵاتییانی نامسوڵمانان دا بكرێ: (...وإن َطَعَنَ طاعِنٌ في ثَقيفٍ أو ظَلَمهم ظالِمٌ، فإنهُ لا يُطاعُ في مالٍ ولا في نَفسٍ، وَأنَّ الرَسولَ يَنصُرهم على مَن ظَلَمَهُم وَ المؤمنون، وَمَن كَرِهوا أن يَلِجَ عليهم من الناسِ، فإنَّهُ لا يَلِجُ عليهِم، وَ إنَّ السوقَ وَالبَيْعَ بأثنيةِ البيوتِ، وَإنهُ لايُؤَمَّرُ عليهم الا بعضُهم على بعض، على بني مالِك أمِيرُهم، وَعلى الأحلافِ أمِيرُهم) .

واتە: هەركەسێك تانە لە سەقیف بدات یان ستەمیان لێ بكات، نابێت بە قسەی بكرێ، چ ستەمیماڵییان لێ بكات، چ ستەمی نەفسیی، وە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) وە ئیمانداران سەریان دەخەن بەسەر هەركەسێك دا كە ستەمیان لێ بكات، [واتە: لەگەڵ ئەوان دان و پشتیوانی ئەوانن] وە هەركەسێك ئەوان حەز نەكەن بێتە نێویان و بێتە سەرزەمینیان، نابێ بچێ، وە بازاڕ و كڕین و فرۆشتنیان لەپێش دەرگاكانی خۆیانە ( دیارە ئەوە مەرجێكی ئەوان بووە) وە هیچ كەسێك بەسەریانەوە ناكرێتە فەرماندەو بەرپرس، مەگەر خۆیان بەرپرس بۆ خۆیان دیاریی بكەن ( واتە: وەك كۆنفیدراڵیی لە ڕووی ئیدارییەوە خۆیان سەرپەرشتیاریی خۆیان بكەن ). وە (بنی مالك) فەرماندەی خۆیان دەبێ و (أحلاف)یش فەرماندەی خۆیانیان دەبێ (وادیارە دوو هۆز بوون).

ئنجا کۆتاییی ئەم بەڵگەی چوارەمە، بەم قسەیەی (عبدالوهاب خلاف) دێنین کە دەڵێت: (قرَرَّ الإسلام المُساواة بينَ الذِّميينَ وَالمسلمين، فَلَهم ما للمسلمين وعليهم ماعليهم وَكَفَلَ لهم حُرِّيَتَهم فأمَرَ المسلمين أَن يُتَركوهم وما يَدينون ولا يَتَعَرضُّوا لَهم فيما يَعْتَقِدون، وَعلى أساسِ هذهِ المُساواةِ لهم أن يَتَعامَلُوا مَعَ المُسلمين جميعَ المُعاملاتِ المُباحةَ)[1].

واتە: ئیسلام بڕیاری داوە مامەڵەی یەکسان لەگەڵ هاوپەیمانان و لەگەڵ مسوڵمانان دا بکرێت، مسوڵمانان چ مافێکیان هەیە ئەوانیش هەیانە، وە مسوڵمانان چ ئەرکێکیان لەسەرە، ئەوانیش لەسەر شانیانە، وە ئیسلام ئازادیی تەواوی بۆ دەستەبەر کردوون، وە فەرمانی بە مسوڵمانان کردوە کە لێیان گەڕێن [واتە: لە نامسوڵمانان] بەو شێوەیەی کە بۆ خۆیان دینداریی دەکەن، وە هەرشتێك کە بۆ خۆیان عەقیدەیان پێیەتی، هەقیان بەسەریانەوە نەبێت، وە لەسەر بناغەی ئەم یەکسانییە نامسوڵمانان بۆیان هەیە هەرجۆرە مامەڵەیەکی ڕەوا لەگەڵ مسوڵمانان دا بکەن.

کەواتە: جارێکی دیکەش دەڵێین: ئەو پەیمان و بەڵێنانە کە لە نێوان مسوڵمانان و نامسوڵمانان دا دەبەسترێن، دیسان ئەوە دەخوازن کە پێویستە مامەڵەی یەکسانیان لەگەڵ دا بکرێ، وە بەیەکچاو لەگەڵ مسوڵمانان دا تەماشا بکرێن.

وشەی (الذمة)یش کە هەندێك وادەزانن جۆرێك لە نوقصانیی پاڵدانە لای نامسوڵمانانی تێدایە، وانیە، چونکە: ( الذِمةُ: العهدُ و الأمانُ والكفالةُ، وفي الحديثِ: المسلمون تَتَكافَأُ دِماؤهم ويسعى بذِمَّتِهم أدناهُم، وأهلُ الذِمَّةِ: المُعاهَدونَ من أهلِ الكتابِ، ومن جرى مجراهم)[2].

واتە: (الذمة) یانی: پەیمان و ئەمان و کەفالەت کردن، وە لە فەرموودەی دیکەی پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیه وسلم) هاتوە: ئیمانداران خوێنیان

---

(١) السياسة الشرعية و نظام الدولة الإسلامية في الشؤون الدستورية والخارجية والمالية، ص٩١.

(٢) المعجم الوسيط، ص٣١٥.

یەکسانە، وە کامیان لەهەموویان بچووکترە، دەتوانێت لە جیاتی هەموویان پەیمان بدات و بەڵێن بدات، (أهل الذمة)ش واتە: ئەوانەی کە پەیمانیان لەگەڵ بەستراوە لەخاوەن کتێیبەکان و غەیری خاوەن کتێبەکانیش.

کەواتە: وشەی (ذمَّة) هیچ نوقصانییەکی تێدا نیە، بەڵام هەندێ وشە بەپێی عورف و باو مانایەکی هەڵە دەگەیەنێ، ئەگەرنا (الذمة) یانی: بەڵێن و پەیمان، ئنجا مسوڵمانیش کە دەچێت لە دەوڵەتێکی نامسوڵمانان دا دادەنیشێ، دیارە ڤیزەی پێ دەدەن ئەوجار مافی مانەوەی پێ دەدەن، یانی: لەسەر بناغەی بەڵێن و پەیمانێك لەوێدا دەبێتە هاووڵاتیی ئەوان و لەوێ نیشتەجێ دەبێ.

## بەڵگەی پێنجەم:

## بناغەی هەڵس وکەوتی مسوڵمانان، لەگەڵ نامسوڵمانانی لاشەڕ و بێ زیاندا، چاکەکاری و هاوکارییە:

مسوڵمانانێکی لاشەڕ و بێ زیان، کە ئامادەن ئەندامێکی لاشەڕبن لە دەوڵەتێکی ئیسلامییدا، بناغەی هەڵسوکەوت لەگەڵیان دا بریتیە لە چاکەکاریی و هاوکاریی (البر والإقساط) ئەمەش کۆتا بەڵگەی ئێمەیە لەسەر ئەوە، کە دەوڵەتێکی ئیسلامیی پێویستە مامەڵەی یەکسان لەگەڵ هەموو پێکهاتەکانی کۆمەڵگاکەی دا بکات، وەبەیەك چاو تەماشایان بکات، جگە لەوەی کە بەبەڵگەیەکی شەرعیی ڕوون و بێ چەند و چوون، تایبەت دەکرێ بە مسوڵمانانەوە، یان بە نامسوڵمانانەوە، بەڵگەشمان لەسەر ئەوە، ئایەتی ژمارە (٨)ی سوورەتی (الممتحنة)یە، کە خوا دەفەرموێ:

﴿ لَّا يَنْهَىٰكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ لَمْ يُقَٰتِلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوٓا۟ إِلَيْهِمْ ۚ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ ﴿٨﴾ ﴾

واتە: خوا لێتان قەدەغە ناکات کەسانێك کە لەسەر دینتان جەنگیان لەگەڵ نەکردوون، وە لەماڵ و حاڵی خۆتان وەدەریان نەناون، کەلە گەڵیان دا چاکە کاربن و بەخشەربن، بێگومان خوا بەخشەرانی خۆش دەوێن.

لێرەدا یەکێك بۆی هەیە بپرسێ: باشە بۆچی ئەو تەعبیرە بەکارهاتوە: ﴿ لَّا يَنْهَىٰكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ لَمْ يُقَٰتِلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوٓا۟ إِلَيْهِمْ ... ﴿٨﴾ ﴾ ؟ لە جیاتی ئەوەی بفەرموێ: خوا فەرمانتان پێ دەکات کە لەگەڵیان دا چاکەکار بن و بەخشندە بن؟ وەڵامەکەی ئەوەیە کە ئەم ئایەتانە لە دۆخێك دا هاتوونە خوارێ، کە مسوڵمانان لەگەڵ نامسوڵمانان دا لە حاڵەتی جەنگ و بەرەنگاریی دا بوون و، هەمیشە کافرەکان لە خەیاڵی ئەوەدا بوون، پەلاماری شاری مەدینە بدەن، وە بەردەوام پەلاماری مسوڵمانانیان دەدا و

هێرشیان دەکردنەسەر، وە هەرکات مسوڵمانانیان لێ هەڵکەوتبایە، دەیانکوشتن، بۆیە خوا (سُبحانَهُ وَتَعالى) لەبەر ئەوەی بارودۆخێکی وا لە ئارادا بووە، کە وەك چۆن نامسوڵمانان لە مسوڵمانان خەفتاون کە زەبریان لێ بدەن، ئەو حاڵەتە نەفسییە لەلایەن مسوڵمانانیشەوە هەبووە، چونکە کەس لە شەڕشەکری نەبەخشیوەتەوە!! بۆیە خوا (سُبحانَهُ وَتَعالى) دەفەرموێ: (وا مەزانن کە هەرچی کافر و نامسوڵمان بوو بۆتان هەیە لەگەڵیان دا بجەنگن، بەڵکو ﴿ لَّا يَنْهَىٰكُمُ ﴾ خوا لێتان قەدەغە ناکات کەسانێك کە لەسەر دینتان لەگەڵتان ناجەنگن، وە لەماڵ و حاڵی خۆتان وەدەرتان نانێن، (ئەوانە با نامسوڵمانیش بن) خوا لێتان قەدەغە ناکات کەلەگەڵیان دا چاکەکار بن لە ڕووی مەعنەوییەوە، وە بەخشەر بن و هاوکارییان بن، لە ڕووی ماددییەوە، کەواتە: هۆی بەکارهێنانی ئەو تەعبیرە ئەو دۆخە سیاسییەیە کە لەو کاتەدا حاکم بووە.

ئنجا وشەی (البر) ڕاغبی ئەصفەهانیی بەم جۆرە پێناسەی دەکات: (البِرُّ: التَوسُّعُ في فِعلِ الخَيرِ)[1]، (البِرِ) بریتیە لە فراوانیی لە ئەنجامدانی چاکە دا، دەربارەی وشەی (الإقساط)یش کە دەفەرموێ: ﴿ .. وَتُقْسِطُوٓاْ إِلَيْهِمْ ... ﴾ دەڵێ: (الإِقساطُ: أَن يُعطي قِسطَ غَيرِه)، واتە: (إقساط) ئەوەیە کە کەسێك بەشی بەرامبەرەکەی بەشی غەیری خۆی بدات، بە پێچەوانەی (قَسْط)ەوە: (القَسْطُ: أن يأخذ قِسطَ غيرِه)[2] یانی: (قَسْط) ئەوەیە کە کەسێك بەشی غەیری خۆی بۆ خۆی بەرێ.

کەواتە: بناغەی هەڵسوکەوتی مسوڵمانان، جا چ لە کۆمەڵگایەك دا بن، چ لە دەوڵەتێك دابن [واتە: کۆمەڵگایەك کە قەوارەیەکی سیاسی هەبێت] لەگەڵ نامسوڵمانانی بێ زیان و لاشەڕ دا، لەگەڵ هاووڵاتییانی سەلامەت و تەبا دا، بریتیە لە چاکەکاریی، بەخشندەیی، چاکەکاریی لە ڕووی مەعنەوییەوە، کە ڕێزلێگرتن دەگرێتەوە، سەلام لێکردن دەگرێتەوە، سەردان و هاموشۆ دەگرێتەوە،

---

(١) مفردا ألفاظ القرآن، ص١١٤.

(٢) هەمان سەرچاوە، ص٦٧٠.

هەرچی جۆری چاکەکردنە، لە ڕووی مەعنەوییەوە هەمووی دەگرێتەوە، وە بەخشندەییش، واتە: هاوکاریی ماددییان بکرێت، دیارە زۆربەی توێژەرەوانی قورئان، ئەم ڕستەیەی: (وَتُقسِطوا إليهِم) یان،بە: (أن تَعدِلوا مَعَهُم) [لە گەڵیان دا دادگەر بن] لێکداوەتەوە،بەڵام من گومانم نیە کە ئەم جۆرە لێکدانەوەیە هەڵەیە، چونکە دادگەر (عادل، مقسط) بوون لەگەڵ هەمو و کەس دا، چ مسوڵمان بێت، چ نامسوڵمان بێت، وە چ لە حاڵەتی ئاشتیی و تەباییدا بێت، چ لە حاڵەتی جەنگ دا بێت، دادگەربوون هەمیشە فەرزە و هەردەم مسوڵمان دەبێ، دادگەر بێ، ئنجا بەپێی ئەو لێکدانەوەیە، چەمکی پێچەوانەی ئەو ڕستە قورئانییە ئاوای لێ دێت: ( نامسوڵمانانێك کە دژایەتیی دین و ژینتان دەکەن، خوا ڕێتان لێ دەگرێ کە لە گەڵیان دا چاکەکار و دادگەر بن)! بەڵام بێگومان ئەوە هەڵەیە چونکە ئەوە [واتە: ئەم چەمکە پێچەوانە (مفهوم المخالفة)یە] ئەگەر (وَتُقسِطوا إليهِم) بە مانای [دادگەرییا لەگەڵ بکەن] بێ، لەگەڵ دەقی ئایەت دا تێکدەگیرێ، وەك خوا(سُبحانَهُ وَتَعالى) لە سوورەتی (المائدة) -٨- دا دەفەرموێ:

﴿...وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَـَٔانُ قَوْمٍ عَلَىٰٓ أَلَّا تَعْدِلُوا۟ ۚ ٱعْدِلُوا۟ هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَىٰ... ﴿٨﴾﴾.

واتە: وە با ڕقلێهەڵسانتان لە کۆمەڵێك ( کە دیارە مسوڵمان ڕقی، لە کۆمەڵی کافرانە، کافرانێکی سەنگەرگرتوو لە مسوڵمانان) واتان لێ نەکات لەگەڵیان نادادگەر بن، دادگەر بن ئەوە لە پارێزکارییەوە نزیکترە، ئنجا گومانی تێدا نیە کە دادگەریی (عدل) بەهایەکی پێویستە لە هەموحاڵێك دا، لەگەڵ دۆست و دوژمن، لەگەڵ کافر و مسوڵمان دا، کەواتە: کە خوا دەفەرموێ: ( خوا لێتان قەدەغە ناکات کە ئەوانەی دژی دینتان نین و دژی ژینتان نین، لەگەڵیان دا چاکەکار و دادگەر بن)، دەڵێین: هیچ کاتێك دادگەربوون قەدەغە نیە، بۆیە لێرەدا نابێ مەبەست لە (تُقسِطوا إليهِم) دادگەریی بێت، چونکە دادگەریی لە هیچ حاڵێك دا قەدەغە نیە، بەڵکو هەموو کاتێك پێویستە لەگەڵ مسوڵمان و نامسوڵمانان، وە لەگەڵ دۆست و دوژمن دا.

ئنجا دەڵێین: ئەم ئایەتە موبارەکە تەرازووی هەڵسوکەوتی مسوڵمانان لەگەڵ نامسوڵمانان دیاریی دەکات، کە بریتیە لەوەی ئەگەر نامسوڵمانان دژی دین و ژینی مسوڵمانان بوون، ئەوانیش بۆیان هەیە بەرپەرچیان بدەنەوە و دژایەتییان بکەن، بەڵام لەو حاڵەش دا هەرنابێ ستەمیان لێبکەن و لەگەڵیان دا نادادگەربن، بەڵام ئەگەرهات ئەوان دژی دین و ژینی مسوڵمانان نەبوون، ئەوە مسوڵمانان نەك هەر لەسەریان پێویست نیە دژیان بن، بەڵكو بۆشیان نیە، بگرە بەپێچەوانەوە لەسەریان پێویستە کەلەگەڵیان دا چاکەکار و بەخشندەش بن، چاکەکار بن لە ڕووی مەعنەوییەوە و، بەخشندە و بەخشەر بن لە ڕووی ماددیی و هاوکاریی ماددییەوە.

ئنجا لێرەوەش بۆمان دەردەکەوێ کە هەندێك کەس هەندێك ئایەتی موبارەکی قورئانی بەرز و مەزن لە غەیری شوێنی گونجاوی خۆیدا، بەکاردێنێ بۆ وێنە: خوا (سُبحانَهُ وَتَعالی) لە سوورەتی (الفتح) -٢٩- دا، دەربارەی هاوەڵانی بەرێزی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) یاخود هەموو ئەوانەی کە لە خزمەت پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دان، بە درێژایی زەمان و بە پانایی مەکان، دەفەرموێ:

﴿... أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلْكُفَّارِ...﴾ واتە: لەسەر کافران توند و تیژن.

وە لە سوورەتی (المائدة) - ٥٤ -دا، دەفەرموێ:

﴿... أَعِزَّةٍ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ ...﴾. واتە: ئیمانداران لەبەرانبەر کافران دا زبر و بەدەمارن.

وە لە سوورەتی (التوبة) -١٢٣-دا، دەفەرموێ:

﴿... وَلْيَجِدُواْ فِيكُمْ غِلْظَةً...﴾

واتە: با کافرەکان زبرییتان پێوە ببینن، یەکێك بۆی هەیە بڵێت: ئەوەنیە خوا (سُبحانَهُ وَتَعالی) باسی (شدة و عزة و غلظة) دەکات لە بەرانبەر کافران دا؟ دەڵێین: بەڵێ، بەڵام ئەو سێ ئایەتە و گەلێك ئایەتی دیکەش، باسی حاڵەتی ڕووبەڕووبوونەوەی مسوڵمانان و نامسوڵمانان دەکەن و، لە حاڵەتی ڕووبەڕووبوونەوە و جەنگ دا

پێویستە مسوڵمان سەخت وزبر و دڵقایم و پتەوبێ، چونکە وەك گوتراوە: (کەس لە شەڕدا شەکری نەبەشیوەتەوە)! کەواتە: ئەم ئایەتانە و وێنەی ئەم ئایەتانە، مەبەست پێیان حاڵەتی ڕووبەڕووبونەوە و بەرەنگاربوونەوەیە، بەڵام حاڵەتی ئاشتیی و تەبایی، بەتایبەتی لەگەڵ نامسوڵمانانێك دا کە لە ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامییدا دەژین، بناغەی هەڵسوکەوت، بریتیە لە چاکەکاریی و هاوکاریی.

ئنجا بۆ ئەوەی چەمك و واتای چاکەکاریی (البِرّ) کە خوا دەفەرموێ: (أَن تَبَرُّوهم وَتُقسِطواإليهِم) زیاتر لە زەیندا درەوشاوە بێت، با سەرنجی لێکدانەوەی (القرافی) بدەین کە لە کتێبی (الفروق) دا پێناسەی چاکەکاریی (بِرّ) دەکات، واتە چاکەکاریی لەگەڵ نامسوڵمانان دا جوان شی دەکاتەوە و دەڵێ: ( البِرُّ: هوَ الرِّفقُ بِضَعيفِهم، وسَدُّ خُلَّةِ فَقيرِهم وَإطعامُ جائعِهم، وَكَساءُ عارييهم، وَلينُ القولِ لهم على سبيلُ التَلَطُّفِ لَهم وَالرَّحمةِ، لا على سبيلِ الخوفِ والذِلَّةِ، و احتمالُ أذِيَّتِهم في الجِوارِ مع القدرَةِ على إزالتةِ، لُطفاً مِنّا بِهم، لا خوفاً وَطَمَعاً، والدعاءِ لَهم بالهِداية، وأن يُجَعلُوا من أهلِ السعادةَ، ونَصيحتهم في جميعِ أُمورهم، في دينهم وَدُنياهُم، وَحفظِ غَيبَتِهم، اذا تَعَرَّض أَحَدٌ لِأذيتَّهم، وَصونُ أموالِهم وَعيالِهم وأعراضِهم، وَ جميعِ حقوقِهم وَمصالِحهم وأَنْ يُعَانوا على دفعِ الظُلمِ عنهم، وإيصالِهم الى جميعٍ حقوقهم)[1].

واتە: چاکەکاریی لەگەڵ نامسوڵمانان دا [لەلایەن مسوڵمانان و دەوڵەتی ئیسلامییەوە] بریتیە لە:

١- نەرم ونیانیی لەگەڵ کەسێکیان دا کە بێهێزە.

٢- وە پڕکردنەوەی کەلێنی هەژار و نەدارێکیان (ئەوانەی کە ئاتاجن هاوکاریی بکرێن) وە پێداویستییەکانیان جێبەجێ بکرێن.

٣- وە ئەوەیان کە برسییە تێر بکرێ.

٤- وە ئەوەیان کە ڕووتە پۆشتە بکرێ.

---

(١) الفروق، ج٣ ص١٥.

٥- وە قسەی نەرم لەگەڵ کردنیان بە شێوەی موڵاتەفە و بەزەیی، نەك بە هاندەری لێترسان و زەبوونیی بەرانبەریان لەلایەن مسوڵمانانەوە.

٦- وە بار قووڵیی لەگەڵ ئازاریان دا (کاتێك مسوڵمانێك ئازار دەدەن) لە حاڵەتی دراوسێیەتیی و نزیکیی دا، لەگەڵ ئەوەش دا کە توانایش هەبێ بۆ لابردنی ئەو ئازارە، بەڵام با چاوپۆشییان لێ بکرێ، بە شێوەی لوتف لەگەڵ نواندن و بەزەیی پێداهاتنەوە، نەك لەو ڕووەوە کە ترسمان لێیان بێت، یاخود تەماعمان پێیان بێت.

٧- وە بۆ پاڕانەوەیان کە خوا هیدایەتیان بدات و بەختەوەریان بکات و سەرفرازیان بکات لە دوارۆژ دا، (واتە: بیانکات بەئەهلی ئیمان).

٨- وە بۆ دڵسۆزبوونیان لە هەموو کاروبارێکیان دا، چ پەیوەندیی بەدینداریییانەوە هەبێت، چ بە دنیاداریییانەوە.

٩- وە لە کاتێك دا کەئامادە نابن، پاراستنی کەسایەتییان.

١٠- وە لەحاڵێك دا کەسێك بیەوێ ئازاریان بدات، بەرگریی لێکردنیان.

١١- وە پاراستنی ماڵ و سامانیان.

١٢- وە پاراستنی منداڵ و خێزانیان.

١٣- وە پارستنی سومعە و کەرامەتیان.

١٤- وە پاراستنی هەموو مافەکانیان و هەموو بەرژەوەندییەکانیان.

١٥- وە دەبێت هاوکاریی بکرێن کە ستەم لە خۆیان دوور بخەنەوە، (واتە: ئەگەر کەسێك ویستی دەستدرێژییان بکاتە سەر، پشتگیرییان بکرێ و بەرگرییان لێ بکرێ).

١٦- وە هەوڵ بدرێ کە هەموو مافەکانیان بۆ دابین بکرێن[1].

---

(١) ژمارەی بڕگەکان خۆم دامناوە.

ئەمە چەمك و واتای ئەو ڕستە موبارەکەیە کە خوا دەفەرموێ: (أن تَبَرُّوهم وَتُقسِطواالیهِم) کۆتایی ئەم باسەش -واتە: ئەوە کە دەبێ دەوڵەتی ئیسلامیی مامەڵەی یەکسان بکات لەگەڵ هاووڵاتییەکانیدا، بەمسوڵمان و نامسوڵمانەوە- باسە بەم سێ کورتە بەسەرهاتە دێنین:

**بەسەرهاتی یەکەم:**

لە کتێبی: (الخَراج)ی (أبی یوسف)دا هاتوە: ( مَرَّ عُمَرُ بنُ الخطابِ رضي اللهُ عنهُ بِشَيخٍ مِن أهلِ الذمَّةِ يَسألُ على أبوابِ المساجِدِ، بِسَبَبِ الجِزيَةِ والحاجةِ والسِّنِ، فقَال: ماأنصَفناكَ، كُنّا أخَذنا مِنكَ الجِزيَةَ في شَبيبَتِكَ، ثُمَ ضيَّعناكَ في كِبَرِكَ، ثُمَ أجرَى عليه من بيتِ المالِ مايُصلِحهُ، وَوَضعَ عنهُ الجِزيَةَ وعن ضرَبائه)[١].

واتە: (عومەری کوڕی خەتتاب) خوا لێی ڕازی بێت لەسەردەمی خیلافەتی خۆیدا، بەلای پیاوێکی بەتەمەنی ئەهلی زیممەدا (ئەوانەی کە هاوپەیمانن لەگەڵ مسوڵمانان دا و لەدەوڵەتی ئیسلامییدان) تێپەڕی کە لە دەرگای مزگەوتان سواڵی دەکرد (داوای دەکرد کە هاوکاریی بکرێت) بەهۆی ئەوەوە کە سەرانەی لەسەر بوو، وە ئاتاج بوو و، بەتەمەنیش بوو، (عومەر) خوالێی ڕازی بێت [خەلیفەی دووەمی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)]، پێی گوت: لەگەڵ تۆدا دادگەر و، بەئینصاف نەبووین، ئەگەر هەتا گەنج بووی سەرانەمان لێ وەرگرتووی و ئێستا لەکاتی بەتەمەنییدا پشتگوێت بخەین! دوایی لە خەزێنەی دەوڵەتی ئیسلامیی مووچەی بۆ بڕیەوە، بایی ئەوەندە کە بەشی بکات، وەسەرانەشی لەسەر لابرد، هەروەها لەسەر ئەوانەش کە وەك ئەون. یانی: بڕیارێکی دەرکرد کە هەموو ئەوانەی نامسوڵمانن و سەرانە دەدەن و، کەوتوونەتە تەمەنەوە، یان هەژار و نەدارن، سەرانەیان لەسەرلابەرن، نەك هەر ئەوەندە، بەڵکو مووچەشیان بۆ ببڕنەوە، بۆ ئەوەی کە پێویست نەکات داوا لەخەڵك بکەن و دەست لەخەڵك پان بکەنەوە.

---

(١) الخراج، ص١٤٤.

**بەسەرهاتی دووەم:**

(خالد بن الولید) خوا لێی ڕازی بێ، لەگەڵ ئەهلی حیرە لە عێراق دا پەیمانێکی ئیمزا کرد، کە دیارە ئەهلی حیرە لە عێراق نەصرانیی بوون، ئنجا لەو پەیمانەدا هاتوە: (وَجَعلتُ لهُم أيُّما شيخٍ ضَعُفَ عن العَمَلِ، أو أصابَتهُ آفَةٌ من الآفاتِ، أوكانَ غنياً فَأفْتَقَرَ وَصارَ أهلُ دينِهِ يَتَصَدَّقونَ عليه، طُرِحَت جَزْيَتُهُ وَعِيلَ من بيتِ مالِ المسلمين وَعيالِهُ، ما قامَ بِدارِ الهِجرَةِ وَ دارِ الإِسلامِ)[١].

واتە: وە هەرپیاوێکی بەتەمەنیان (چونکە سەرانە تەنیا لەسەر پیاوان بووە و لەسەر ئافرەتان نەبووە و، لەسەر منداڵانیش نەبووە) نەیتوانی کار بکات، یاخود بەڵایەکی تووش بووبوو لە بەڵایان، یان نەخۆش بوو، یان هەژار کەوتبوو، [یانی: دوای دەوڵەمەندیی هەژار کەوتبوو] بەشێوەیەك کە ئەهلی دینەکەی خۆی خێریان پێ دەکرد و هاوکارییان دەکرد، ئەوە پێویستە سەرانەی لەسەر لاببرێت، وە لە خەزێنەی ماڵی مسوڵمانان، خۆی و ماڵ و منداڵەکەی بژیەندرێن و مووچەیان بۆ بڕدرێتەوە، مادام لە مەنزڵگای کۆچکردن و مەنزڵگای ئیسلام دا بن، [یانی: مادام هاووڵاتیی بێ لە دەوڵەتی ئیسلامییدا، پێویستە بەو شێوەیە مامەڵەی لەگەڵ دا بکرێ].

**بەسەرهاتی سێیەم:**

کە ئەمیان لە (الأموال)ی (أبو عبید) دا هاتوە: (كَتَبَ عُمَرُ بنُ عبدالعزيز الى عَدَي بن أرطَأة عامِلِه على البَصرَة قائلاً: و أُنظُر مَن قِبَلَكَ من أهلِ الذِمَّةِ، مَن كَبُرَت سِنُّهُ، وَ ضَعُفَت قُوَّتُهُ، وَوَلَّت عنهُ المَكاسِبُ، فَأَجْرِ عليهم من بَيتِ مالِ المسلمين ما يُصلِحُهُ)[٢].

واتە: عومەری کوڕی عبدالعزیز خوا لێی ڕازی بێت - کەبەپێنجەم خەلیفەی ڕاشید ناوی دەرکردوە، چونکە لە دوای چوار خەلیفەکان خوا لێیان ڕازی بێ ئەم بەڕاستیی لەسەر ڕێوشوێنی ئەوان دەڕۆیشت، شایانی باسیشە کە

---

(١) الخراج، ص١٤٤

(٢) ص٥٧.

دیارە لە تەرەفی دایکیشیەوە دەبێتەوە بە نەوەی عومەری کوڕی خەتتاب - نامەی نووسی کە خەلیفەی مسوڵمانان بوو بۆ والییەکەی لەشاری بەصرە، کە ناوی (عەدیی کوڕی ئەرتەئە) بوو: سەرنج بدە! ئەوانەی کە ئەهلی زیممەن، [هاووڵاتییانیی نامسوڵمانن] ئەوەیان کە بەساڵدا چووە، وە هێزی نەماوە، وە کاروکەسابەتێکی وای نیە، لە خەزێنەی ماڵی مسوڵمانان مووچەیەکی بۆ ببڕنەوە، بایی ئەوەندە کە کاروباری ڕاییی بکات، وە ژیانی دابین بکات.

ئەمەش بەڵگەی پێنجەم لەوبارەوە کە دەوڵەتی ئیسلامیی مامەڵەی یەکسان لەگەڵ هاووڵاتییانی دا دەکات بە مسوڵمان و نامسوڵمانەوە.

ئێستا دەچینەسەر بڕگەی پێنجەمی بابەتی: نامسوڵمانان لە ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامییدا.

# بەشی پێنجەم

## هاووڵاتییانی نامسوڵمان لە کۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامییدا، دروستە ئەرکە گشتییەکان ( الوظائف العامة ) یان پێ بسپێردرێن بە پێی لێهاتووییان

ئەم مەسەلەیە لەم ڕۆژگارەدا زۆر دەورووژێنرێ، کە: ئایا دەوڵەتی ئیسلامیی مادام مامەڵەی یەکسان لەگەڵ هاووڵاتییانی دا بکات، بەمسوڵمان و نامسوڵمانەوە و، ماف و ئازادییەکان بۆهەموویان دابین بکات، ئایا لە بواری ئەرکی گشتی پێ سپاردن دا، چۆن مامەڵە لەگەڵ نامسوڵماناندا دەکات؟ لە وەڵام دا دەڵێم: لە ڕاستییدا دوای سەرنجدان و لێ تێگەیشتنی باسەکانی ڕابردوو، ئەم مەسەلەیە زۆر ڕوون و درەوشاوەیە و، دەتوانین زۆر بەڕاشکاویی بڵێین: دروستە، سەرجەم ئەندامان و هاووڵاتییانی نێو کۆمەڵگا و دەوڵەتێکی ئیسلامیی، ئەرك و کارە گشتییەکانیان پێ بسپێردرێن، بەبێ هەڵاواردن، مادام شایستەیی و توانایان هەبێت، بەبێ تێ خوێندنەوە و ڕەچاوکردنی ئینتیمای ئایینیی و فیکریی و عەقیدەییان، ئەویش لەبەر پێنج هۆکار، کە هەرکامیان ئامانجێکی بنەڕەتیی ئیسلامە:

١- بۆ ئەوەی دادگەریی بچەسپێت، چونکە پێشتر باسمان کرد، کە دادگەریی بناغەی حکومڕانییە لە ئیسلام دا.

٢- بۆ ئەوەی ئینسانەکان وەك ئینسان، کەسایەتییان و ڕێز و حورمەتیان پارێزراو بێت، چونکە باسمان کرد، کە ڕێزگرتن لە ئینسان و پاراستنی کەسایەتیی و پاراستنی ڕێز و حورمەتی، یەکێکە لە بەها بنەڕەتییەکانی ئیسلام، بەبێ تێخوێندنەوەی ئەوەکە ئایا ئەو مرۆڤە مسوڵمانە، یان نامسوڵمانە؟ مادام مرۆڤە، خوا ڕێزی لێناوە و کردوویەتی بە جێنشینی خۆی لەسەر زەوی.

٣- بۆ ئەوەی ماف و ئازادییەکان بۆ هەموو لایەك دابین بکرێن، کە ئەمە لق ودەرەنجامی ئەوەی پێشێیە و ئینسانێك ڕێزی لێ بگیرێت و کسایەتیی بپارێزرێ، دەبێت ماف و ئازادییەکانی بۆ دابین بکرێن دیارە نامسوڵمانانێکیش کە ئامادەن لە ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامییدا بژین و ببنە هاووڵاتیی و ئەهلی مەنزڵگای ئیسلام (دار الإسلام)دەبێ ماف و ئازادییەکانیان بۆ دابین بکرێن.

٤- بۆ ئەوەی ئەو گرێبەستەی لە نێوان ئەوان و دەوڵەتی ئیسلامیی، یاخود مسوڵمانان و نامسوڵمانان دا بەستراوە، پابەندیی پێوە بکرێت، ئەو گرێبەستەش

بریتیه لەوە کە مامەڵەی یەکسان و دادگەرانەیان لەگەڵ دا بکرێت.

٥- تاکو ئەوەی کە خوا فەرموویەتی کە دەبێ لەگەڵ هاووڵاتییانی نامسوڵمان دا چاکەکار و بەخشەر بن، کە ئەوە بناغەی هەڵسوکەوتی مسوڵمانانە لەگەڵ نامسوڵمانانێك دا، کە هاووڵاتیین و لاشەڕ و بێ زیانن، بێتەدی.

بەڵێ بەبێ یەکسانبوونی تێکڕای هاووڵاتییانی نێو کۆمەڵگا و دەوڵەتی ئیسلامیی، ئەم پێنج ئامانجەی باسمان کردن، هیچیان نایەنە دی، بەڵکو دەبن بە شیعاری بێ کردار و دروشمی بێ نێوەڕۆك.

ئنجا لێرەدا پێش ئەوەی زیاتر بچمە نێو قووڵایی ئەم باسەوە، بە پێویستی دەزانم ئاماژە بەوە بکەم بەهەندێك ئایەتی خوای پەروەردگار، کە هەندێك لە زانایان کردوویانن بە بەڵگەی ئەوە کە: نامسوڵمانان نابێت هیچ کارێکیان لەدەوڵەتی ئیسلامییدا پێ بسپێردرێ و، هیچ بەرپرسیارێتییەکیان هەبێ، بەتایبەت ئەوانەیان کە هەستیار و گرنگن.

١- یەکێك لەو ئایەتانە، ئایەتی ژمارە (١١٨)ی سوورەتی (آل عمران)ە، کە خوا دەفەرموێ:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ بِطَانَةً مِّن دُونِكُمْ لَا يَأْلُونَكُمْ خَبَالًا وَدُّواْ مَا عَنِتُّمْ قَدْ بَدَتِ ٱلْبَغْضَآءُ مِنْ أَفْوَٰهِهِمْ وَمَا تُخْفِى صُدُورُهُمْ أَكْبَرُ قَدْ بَيَّنَّا لَكُمُ ٱلْأَيَٰتِ إِن كُنتُمْ تَعْقِلُونَ ﴿١١٨﴾ ﴾

واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! جگەلە خۆتان مەکەنە شوێنی نهێنیی و جێی ڕاز و نیازی خۆتان، چونکە ئەوانە کەمتەرخەمیی ناکەن لە تێکدانی ئێوەدا، وە حەز بەناڕەحەتییتان دەکەن، دوژمنایەتیی لە زاریان دەرکەوتوە و، ئەوەی سینەیان پەنهانی کردوە گەورەتریشە (لەوەی دەریانخستوە).

**ئێمەش دەڵێین:**

ئەم ئایەتە بەڵگە نیە لە سەر ئەوە، چونکە لە ڕاستییدا کەسانێك بەو شێوەیە بن، هەرکەسێك بن، ئەگەر گریمان مسوڵمانیش بن ( کە ناگونجێ کەسێك مسوڵمان بێو، ئاوا بێ بەرانبەر بە مسوڵمانان، مەگەر لە حاڵەتی نیفاقدا بێ ) کەسانی ئاوا، ئەهلی ئەمانەت نین، بۆیە ناگونجێ ئەرکی گشتییان پێ بسپێردرێ، لەبەر ئەو سیفەت و هەڵوێستانەیان، نەك لەبەرئەوەی نامسوڵمانن، وە ئەم ئایەتە لە سیاقێکدا هاتۆتە خوارێ کە باسی هەڵوێستی دوژمنکارانەی بەشێك لە خاوەن کتێبەکان دەکات، لەگەڵ مسوڵمانان دا.

٢- ئایەتێکی دیکە لەوبارەوە کە بە بەڵگەی دێننەوە، ئایەتی (٥٩)ی (النساء)ە، کە خوا دەفەرموێ:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡ ... ﴿٥٩﴾ ﴾

واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! فەرمانبەریی خوا بکەن، وەفەرمانبەریی پێغەمبەر بکەن، وە هی کاربەدەستانێك کە لە خۆتانن، دەڵێن: خوا لێرەدا فەرزی کردوە کە کاربەدەستانی ئیماندار دەبێ فەرمانبەرییان بۆ بکرێ!، بەڵام ئاوا وەڵام دەدرێتەوە: مادام مسوڵمانان پێکهێنەری سەرەکیی کۆمەڵگا و دەوڵەتی ئیسلامیین، وەنامسوڵمانانیش بەمۆڵەت و بەفەرمانی سەرۆکی دەوڵەت و هاوکارانی ئەرك و کاریان پێ دەسپێردرێ، مانای وایە ئیمانداران هەر فەرمانبەریی مشورخۆرانی خۆیان دەکەن، چونکە بەرپرسیارێتیی سێ دامەزراوە گرنگەکانی: یاسادانان و جێبەجێکردن و دادوەریی، دەبێ ئیماندار و مسوڵمان بن، کەواتە: هەرکەسێکی دیکە لە نامسوڵمانان کارێکی پێ دەسپێردرێ، مانای وایە هەر لە ژێر هەیمەنە و سێبەری مسوڵمانان دایە، وە مسوڵمانان ئەگەر بەرپرسێکیشیان هەبێت بۆ وێنە: وەزیرێکیان هەبێ، یان لەهەر دامەزراوە و دام و دەزگایەکی دیکەدا بەرپرسێکی نامسوڵمان هەبێ، مادام بەرپرسانی سەرەکیی و کەسی یەکەمی ئەو دەوڵەتە، ئیماندار و مسوڵمانە، مانای وایە هەر بەقسەی ئیماندارانی کردوە و فەرمانبەریی هەربۆ ئیمانداران کردوە.

٣- ئایەتێکی دیکە کەلە و بارەوە بەبەڵگەی دێننەوە، ئەوەیە کە خوای زانا دەفەرموێ:

﴿... فَٱللَّهُ يَحۡكُمُ بَيۡنَكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۗ وَلَن يَجۡعَلَ ٱللَّهُ لِلۡكَٰفِرِينَ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ سَبِيلًا ١٤١﴾ النساء -١٤١-.

واتە: خوا لە قیامەت دا دادوەرییتان لەبەیین دا دەکات، وە هیچ ڕێگایەك نارەخسێنێ بۆ کافران لەسەر مسوڵمانان.

ئەم ڕستەیەش هەندێکیان کردوویانە بە بەڵگەی ئەوەی کە نابێ هیچ کافرێك کاربەدەست بێت بەسەر مسوڵمانانەوە، بەڵام دەڵێین: ئەگەر سەرنجی ئایەتەکە بدەین، زۆر بەئاشکرا دیارە کە باسی قیامەت دەکات، خوا دەفەرموێ: ﴿...فَٱللَّهُ يَحۡكُمُ بَيۡنَكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ ...﴾ خوا لە قیامەت دا دادوەرییتان لە بەین دا دەکات، ﴿...وَلَن يَجۡعَلَ ٱللَّهُ لِلۡكَٰفِرِينَ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ سَبِيلًا ١٤١﴾، وە خوا ڕێگا بۆ کافران نارەخسێنێ لەسەر ئیمانداران، واتە: لە قیامەت دا کافرەکان هیچ بەڵگەیان بەدەستەوە نیە لەسەر ئیمانداران، بەڵکو بەڵگە هەر بەڵگەی ئیماندارانە و ئەوان لەسەر دین و ڕێبەکی حەق بوون و، کافرەکان لەسەر ڕێبەکی باتیڵ و پووچ بوون.

ئنجا (ابن کثیر) لە (عبدالرزاق)ەوە لە (المصنَّف)دا ئەمەی هێناوە[1]: (روى عبدالرزاق عن يسيعِ الكِندي قالَ: جاءَ رَجُلٌ الى عليّ بن أبي طالِبٍ رضي اللهُ عنه فقالَ: كيفَ هذهِ الآية:

﴿... وَلَن يَجۡعَلَ ٱللَّهُ لِلۡكَٰفِرِينَ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ سَبِيلًا ١٤١﴾. فقالَ عليٌ: أُدنُهُ أُدنُهُ، ثُمَ قالَ: ﴿... فَٱللَّهُ يَحۡكُمُ بَيۡنَكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۗ وَلَن يَجۡعَلَ ٱللَّهُ لِلۡكَٰفِرِينَ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ سَبِيلًا ١٤١﴾ .[2]

---

(١) المصنَّف، ج١ص١٧٥.

(٢) المصباح المنير في تهذيب تفسير ابن كثير، ص٣٣٢.

واتە: (عبدالرزاق) لە یەسیعی کیندییەوە دەگێڕێتەوە دەڵێت : پیاوێك هات بۆلای (عەلی کوڕی ئەبی تالیب) خوا لیی ڕازی بێ، گوتی: ئەم ئایەتە چۆنە: خوا ڕێگا نادات بە کافران لەسەر ئیمانداران (ڕەنگە مەبەستی ئەوە بووبێ کە کافریش دەستەڵاتیان هەیە و، جاری وایە بەسەر مسوڵمانان دا زاڵ دەبن) چۆن خوا وای فەرمووە؟ عەلی گوتی: نزیك بەوە، نزیك بەوە، [واتە: سەرت نزیك بکەوە]، ئنجا ئایەتەکەی بۆ خوێندەوە و گوتی: تەماشا بکە:

﴿ ... فَٱللَّهُ يَحۡكُمُ بَيۡنَكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۗ وَلَن يَجۡعَلَ ٱللَّهُ لِلۡكَٰفِرِينَ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ سَبِيلًا ١٤١﴾

خوا لە قیامەت دا دادوەرییتان لە بەیندا دەکات، وە ڕێگا نادات بە کافران لەسەر ئیمانداران! [کەواتە: مەبەست پێی قیامەتە].

هەروەها (ابن کثیر) دەڵێ: دەشگونجێت مەبەست پێی ئەوە بێت (أي في الدُنيا بأَن يُسلَّطُوا علَيهِم آستيلاء اُستئصالٍ بالكلية) [1] دەڵێت: واتە خوا ڕێگا نادات کافران بەسەر مسوڵمانان دا زاڵ بن، بەشێوەیەکی وا کە بنبڕیان بکەن.

وە (السدي) وشەی (سبيلاً)ی بە (حجةً) لێکداوەتەوە، واتە : کافران هیچ کاتێك بەڵگەیان بەسەر مسوڵمانانەوە نابێ، بەڵکو هەمیشە ئیمانداران بەڵگەیان لەسەر کافران دەبێ.

کەواتە: لێرەدا مەبەست لەو ئایەتە حوکمڕانیی و دەسەڵات و بەرپرسێتیی نیە، بەهیچ کام لە تەفسیرەکان.

ئێستاش با لەچوار خاڵان دا بابەتی ئەرکی گشتی پێ سپێررانی نامسوڵمانان، لە دەوڵەتی ئیسلامیی دا بخەینە ڕوو:

---

(١) المصباح المنير، ص٣٣٢.

**یەکەم: ناگونجێ پێگەو پایە گشتییەکان، لە کۆمەڵگا و دەوڵەتی ئیسلامییدا، کە مۆرکی ئایینیان هەیە، وە ئیسلامیی بوونی کۆمەڵگا و دەوڵەتی ئیسلامییش دەیانخوازێ بەکەسانی نامسوڵمان بسپێردرێن:**

**وەك:**

### ١ - کەسی یەکەمی دەوڵەتی ئیسلامیی:

ئنجا چ پێی بگوترێ: خەلیفە، یان فەرماندەی ئیمانداران (أمیر المؤمنین)، یان سەرۆك وەزیران، یان سەرۆك كۆمار...هتد، گرنگ ئەوەیە كەسی یەكەم: ئەو كەسەی بڕیاری یەكەمی بەدەستە لە قەوارەیەكی سیاسی ئیسلامییدا، ناگونجێ نامسوڵمان بێ، چونكە یەكەمین بەرپرسیارێتیی سەرۆكی دەوڵەتی ئیسلامیی، بریتیە لە جێبەجێكردنی شەریعەت و، ناگونجێ جێبەجێكردن و پیادەكردنی شەریعەت، بە كەسێك بسپێردرێت كە ئیمانی بەو شەریعەتە نەبێت!

### ٢- فەرماندەی هێزی چەکدار و سوپا:

ئەمیش لە سۆنگەی ئەوەوە كە جەنگ و جیهاد لەسەر مسوڵمانان لە پێناوی خوادا، فەرزە، بۆ پاراستنی وڵاتی مسوڵمانان و دین و ژینی مسوڵمانان و، پاراستنی حورمەتەكانی مسوڵمانان، وەئەوەش ئەركێكی دیكەی گەورەی ئیسلامە و، جەنگ و جیهاد لە ڕێی خوادا یەكێكە لە دروشمەكانی ئیسلام و، یەكێكە لەئەركە شەرعییەكان، وە جۆرێكە لە عیبادەت و تاعەت و لەسەر نامسوڵمانان پێویست نیە، كەواتە: چۆن دەگونجێ كەسێك بكرێتە بەرپرسی ئەو ئەركە گەورە و گرنگە، كە ئەركێكە لە سەر مسوڵمانان پێویست كراوە و، لەسەر نامسوڵمانان پێویست نیە؟!

### ٣- دادوەریی کردن لە نێو مسوڵمانان دا:

ئەمیش دیسان (واتە: سەرۆكی دەستەڵاتی دادوەریی لە نێو مسوڵمانان دا) پێویستە مسوڵمان بێت، دیارە بە پێچەوانەشەوە: لەنێو مسوڵمانانیش دا

پێویستە خۆیان دادوەریی بکەن لە نێوان خۆیان دا، بۆ چارەسەرکردنی کێشەو گرفتەکانیان، لەو بارەوە قازی (عبدالوهاب خلاف) لە کتێبی: (السياسة الشرعية)[1] دا، نووسیویەتی: (ولايُتَعَرَّضُ لهم في شيءٍ من ذالكَ الّا اذا ترافَعُوا الى المسلمينَ وَطَلَبُوا إجراءَ حُكم الإِسلام بينهم).

واتە: نامسوڵمانان بۆ چارەسەری کێشە و مشتومڕەکانیان، هیچ کەسێك دەستوەرناداتە کاروباریانەوە، مەگەر خۆیان پەنا بێنن بۆ مسوڵمانان و بڵێن: ئەو کێشەیەمان بۆ چارەسەر بکەن، وە داوا بکەن کە بەپێی شەریعەتی ئیسلامیی کێشەکەیان بۆ یەکلابکرێتەوە، لەو حاڵەتەدا مسوڵمانان بۆیان هەیە، ئەگەرنا بۆیان نیە کەواتە: بەهەمان شێوە نامسوڵمانانیش بۆیان نیە، ببنە دادوەر بۆ مسوڵمانان، بۆ چارەسەرکردنی کێشەو گرفتەکانیان، وەك چۆن مسوڵمانانیش بۆیان نیە، مەگەر خۆیان سکاڵایان بێننەلا و داوای دادوەرییان لێ بکەن.

### ٤- هەڵهێنجانی یاسا شەرعییەکان لە قورئان و سوننەت:

ئەمیش شتێکی ئاشکرایە کە بابای نامسوڵمان بۆی نیە، قورئان و سوننەت بۆ مسوڵمانان تەفسیر بکات، وە ئیجتیهادیان بۆ بکات و، یاساشەرعییەکانیان بۆ هەڵبهێنجێنێ، چونکە ئەوە ئەرکی زانایانی ئیسلامە، کەسانێك کە پسپۆڕن لە شەریعەت دا و، بڕوایان بەو شەریعەتە هەیە و بەدڵ و بەگیان قبووڵیان کردوە، بەڵام کەسێك بڕوای بەشەریعەت و بە قورئان و سوننەت نەبێت، شتێکی نەگونجاوە بڵێی: وەرە یاسامان بۆ هەڵبهێنجە! وەك چۆن مسوڵمانانیش بۆیان نیە بچن بۆ جوولەکە و نەصرانییەکان، یاخود بۆ خاوەن کتێبەکانی دیکە، کتێبەکانی خۆیانیان بۆ تەفسیر بکەن و بۆیان لێك بدەنەوە، یاخود بڵێن: بەپێی کتێبەکەتان ئەوەتان بۆ حەڵاڵە و ئەوەتان لێ حەرامە و، دەبێت وا بکەن و، وا نەکەن! مسوڵمانانیش ئەو مافەیان نیە.

---

(١) ص٩٢.

**ە- پێشنوێژیی کردن و خوێندنەوەی وتاری جومعە یان وتاری جەژن و بۆنە ئایینییەکان:**

ئەمیش شتێکی ئاشکرایە، چونکە دروشمەکانی ئیسلام، تایبەتن بە مسوڵمانانەوە، ئنجا لەبەرانبەردا دیسان مسوڵمانانیش بۆیان نیە بچن پێشنوێژیی بۆ جوولەکە و نەصرانییەکان بکەن، یاخود دروشمە ئایینییەکانیان بۆ جێبەجێ بکەن، کە دیارە ئەوە هەر دروست نیە، هەم لە ڕووی دینداریییەوە و هەم لە ڕووی مافی سیاسییشەوە.

هەروەها هەر ئەرك و کارێکی دیکەش، دەقێکی شەرعیی تایبەتی کردبێت بە مسوڵمانانەوە، دەبێت مسوڵمانان خۆیان بەرپرسی بۆ دابنێن، هەروەها هەر شتێکی دیکەش کە تایبەت بێت بە نامسوڵمانانەوە، پێویستە دیسان ئەوانیش خۆیان بەرپرسێتیی کاروباری خۆیان بکەن، بەڵام جگە لەمانە، لەسەر بناغەی شایستەیی و لێهاتوویی، مسوڵمان و نامسوڵمان لەئەرك و کارەکانی دەوڵەتی ئیسلامییدا بەشدارن.

پێویستە ئەوەش بزانرێ کە لە دەوڵەتی ئیسلامییدا، چ لە ڕۆژگاری چوار خەلیفە ڕاشیدەکان و، چ لە ڕۆژگاری (ئومەوویی و عەبباسیی و عوسمانی) ەکانیش دا، کەم و زۆر بوار بەنامسوڵمانان دراوە، کە ڕۆڵی گرنگ و گەورە بگێڕن، وە زۆر جار پێگە و پۆستی گرنگیان پێسپێردراوە، بۆ وێنە: وەزیر، وەك لە بڕگەی حەوتەم دا باسی دەکەین.

کەواتە: بێجگە لەو ئەرك و کارانەی کە بە تایبەتمەندیی ئیسلام و مسوڵمانان دادەنرێن، دروستە لەسەر بناغەی شایستەیی و لێهاتوویی، لە هەردوو بواری یاسادانان و جێبەجێکردن ( تشريع و تنفيذ )دا، ئەرك و کار بە نامسوڵمانان بسپێردرێ و، ببنە ئەندامی ئەنجوومەنی نوێنەران (پەرلەمان) هەروەها ببنە وەزیر لە ئەنجوومەنی وەزیران دا، دیارە کە دەبنە ئەندامی ئەنجوومەنی نوێنەران (پەرلەمان)یش هەم بۆ نوێنەرایەتیی کردنی خەڵکەکەی خۆیانە و، هەم بۆ بەشداریی کردنە لەدەرکردنی ئەو یاسا و بڕیارانەدا، کە بۆ ئیدارەی دەوڵەت و

حکوومەت دەردەکرێن کە لە سەدا نەوەدوپێنج (٩٥٪)ی ئەو بڕیار و یاسایانە، پەیوەندییان بە حەلاڵ و حەرام و، شتی شەرعیی و ناشەرعییەوە نیە، بەڵکو پەیوەندییان بە کاروباری ئیدارییەوە هەیە، پاشان مادام زۆرینەی ئەندامانی ئەنجوومەنی نوێنەران (پەرلەمان) مسوڵمانن، دیارە ڕێ لە هەر بڕیار و یاسایەك دەگرن، کە پێچەوانەی شەریعەت بێت، کەواتە هیچ ئیشکالێك دروست نابێت.

وە کە دەشبن بە وەزیر و بەڕێوەبەر و هەتا دوایی، لە دەستەڵاتی جێبەجێکردن دا، دیارە ئەرك و کارەکانی خۆیان ئەنجام دەدەن، بە پێی ئەو چوارچێوەیە کە سەرۆك و دەوڵەتی ئیسلامیی و مشورخۆرانی دیارییان کردوە، وە لە بواری دادوەرییشدا وەك گوتمان: نامسوڵمانان مافی خۆیانە، کە لە بواری باری کەسێتیی و شتە تایبەتییەکانی خۆیان دا، کێشەکانی خۆیان لەدادگای خۆیان دا چارەسەر بکەن، وەك خوای دادگەر دەفەرمویٚ:

﴿ ... فَإِن جَآءُوكَ فَٱحۡكُم بَيۡنَهُمۡ أَوۡ أَعۡرِضۡ عَنۡهُمۡۖ وَإِن تُعۡرِضۡ عَنۡهُمۡ فَلَن يَضُرُّوكَ شَيۡـٔٗاۖ وَإِنۡ حَكَمۡتَ فَٱحۡكُم بَيۡنَهُم بِٱلۡقِسۡطِۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُقۡسِطِينَ ﴿٤٢﴾ ﴾ المائدة -٤٢-.

واتە: ئنجا ئەگەر خۆیان هاتنەلات، دادوەرییان لە نێوان دا بکە، یان لێیان بگەڕێ، بەڵام ئەگەر دادوەرییت کرد، بە دادگەرانە دادوەریی بکە لە نێوانیان دا، بێگومان خوا دادگەرانی خۆشدەوێن.

دیارە غەیری ئەو بوارانەی کە تایبەتن بە خۆیانەوە و مۆرکی ئایینییان هەیە، بوارەکانی دیکە کە خاڵی هاوبەشی نێوان مسوڵمانان و نامسوڵمانانن و مۆرکی ئایینییان پێوە نیە، هەموو لایەك تێیاندا یەکسانن.

**بۆ وێنە:**

کێشە و مشتومڕێك دەبیٚ، کەسێك دەکوژریٚ، دزیی و ڕێگریی دەکریٚ، لەو حاڵەتانەدا هەموویان لەبەردەم دادگادا یەکسانن و، پێویستە بە شێوەیەکی دادگەرانە دادوەرییان لە نێوان دا بکریٚ.

**دووەم: هەروەها لەبەرانبەردا، نامسوڵمانانیش، جوولەکە و نەصرانیی و ئەوانی دیکەش، هەموو ئەو ئەرك و کار و پێگانەی کە بە تایبەتمەندیی و دروشم و نیشانەی ئەوان دادەنرێن، دیسان پێویستە قۆرخی خۆیان بن، وە مسوڵمانان بۆیان نیە دەستیان تێوەردەن و، پێویستە هەر خۆیان ئەو پێگە و پۆستانە بەکاربێنن و بەرپرسیان بۆ دابنێن:**

ئنجا دیارە ئێمە بۆ سەلماندنی ئەوە، بێجگە لە واقیعی مێژوویی، بەڵگەی دیکەشمان هەن، بۆ وێنە:

١- لەبەندی (٢٥)ی (الصحيفة)دا - کە پێشتریش باسمان کرد - ئەمە هاتوە: ( وَإِنَّ يَهودَ بني عوفٍ أُمَّةٌ معَ المؤمنين، لليهودِ دينهم وللمسلمين دينهُم)، واتە: وە جوولەکەی بەنی عەوف کۆمەڵێکن لەگەڵ ئیمانداران دا، جوولەکەکان ئاییني خۆیان بەرێوە دەبەن، وە مسوڵمانانیش ئاییني خۆیان، کەواتە: لە تایبەتمەندییەکانی دینی خۆیان دا سەربەخۆن، هەروەك چۆن مسوڵمانانیش لە تایبەتمەندییەکانی دینداریی خۆیان دا سەربەخۆن و، کەسیان دەستوەرناداتە کاری ئەوی دیکە: (لليهودِ دينهم وللمسلمين دينهُم).

٢- بەڵگەیەکی دیکە لەو بارەوە: لە پەیماننامەی کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەگەڵ نەصرانییەکانی نەجران دا ئیمزای کردوە -کە پێشتریش هێناومانە-، وەك (محمد حميدالله) لە: (مجموعة الوثائق السياسية للعهد النبوي والخلافة الراشدة)دا هێناویەتی، لەو پەیماننامەیە داهاتوە: (وَلنجرانَ و حاشيَتها جِوارُ اللهِ و ذمَّةُ محمدٍ النبي رسول اللهِ على أموالهم و أنفُسهم وَ مِلَّتِهم وَ غائبهم و شاهِدِهم وَ عشيرَتهم وَ بِيَعِهم وَكُلِّ ما تحتَ أيديهم، من قليلٍ أو كثير، لا يُغَيَّرُ أُسقُفٌّ من أُسقُفيَّتِهِ، ولا راهِبٌ من رهبانيَّته، ولا كاهِنٍ من كَهانَتِه)[1].

---

(١) ص ١٧٦،١٧٥.

واتە: وە نەجران و ئەوانەی کە لەگەڵ نەجڕاندان، پەیمانیان لەگەڵ خوادا هەیە و ئۆباڵیان لە ئەستۆی موحەممەد پێغەمبەر و ڕەوانەکراوی خوادا هەیە، [واتە: پەیمانیان لەگەڵ خوا و پێغەمبەری خوادا هەیە] لەسەر ماڵ و سامانیان و، نەفسی خۆیان و، دینەکەیان، وە ئەوەیان کە لەوێ نیە و ئەوەیان کە لەوێیە، وە هۆزیان، وە پەرستگاکانیان، وە هەرچی کەلە ژێر دەستیان دایە، لە کەم و لە زۆر، [خواو پێغەمبەری خوا پەیمانیان پێ داون] کەهیچ ئوسقوفێك و هیچ ڕاهیبێك و هیچ کاهینێك [کە ئەوانە هەموویان پۆست و پێگەی دینیین] لە شوێنی خۆیان ناگۆڕدرێن، واتە: هەموو کاروباری تایبەتیی خۆیان لەبەر دەستی خۆیان دایە.

کەواتە: ئەگەر مسوڵمانان هەندێك پێگە کە ئایینەکەیان لێیان دەخوازێ، دەبێ قۆرخی خۆیان بن، بە هەمان شێوەش: هەندێك پێگەو پۆستیش کە نامسوڵمانانیش ئایینەکەیان لێیان دەخوازێ، ئەوانیش بە هەمان شێوە قۆرخی خۆیانن، وە تایبەتن بە خۆیانەوە.

**سێیەم: ڕەنگە یەكێك بپرسێ: بۆچی لە دەوڵەتی مەدینەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)دا، نامسوڵمانان پۆست و پایەی سیاسییان پێ نەسپێرراوە؟!**

من زۆر سەرنجی ئەو مەسەلەیەم داوە و، پێم وایە وەڵامەكەی ئەوەیە، كە زۆر ڕوونە لەو ڕۆژگارەدا نامسوڵمانانی ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامیی خاوەنی ئیدارەی كۆمەڵایەتیی و سیاسیی و ئابووریی خۆیان بوون و، هەركامێكیان بۆ خۆی كاروباری سیاسیی و ئابووریی و كۆمەڵایەتیی خۆی بەڕێوەبردوە و، وەك ئێستا نەبووە كە دامەزراوەی هاوبەش هەبێت و هەموویان تێیدا بەشداربن، بەڵگەشمان بۆ ئیسپاتی ئەو بۆچوونە، ئەوەیە كە لە بەندەكانی صەحیفە دا كە لە نێوان پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و ئیمانداران لە لایەك، وە پێكهاتەكانی دیكەی مەدینەدا بە تایبەت جوولەكەكان، هەروەها بەشێك موشریكەكانیش لە لایەكی دیكەوە، ئەو پەیماننامەیە ئیمزا كراوە، چەند بەندێك با وەك خۆی بێ تێدان، زۆر بە ئاشكرا ئەوەی گوتمان دەردەخەن، كە ئەو پێكهاتانە هەركامێكیان لە ڕووی ئابووریی و سیاسیی و كۆمەڵایەتییەوە، بۆ خۆی كاروباری خۆی بەڕێوە بردوە، بۆ وێنە:

١- لە بەندەكانی: (٤ و٥ و٦ و٧ و٨ و٩ و١٠ و١١) ی ( الصحیفة) دا، یەك تەعبیر دووبارە بۆتەوە: ( يتعاقلون معاقلهم الأولى، و كل طائفةٍ تفدِي عانِيَها بِالمعروفِ والقِسطِ بينَ المؤمنين )، لە پێش دا باسی ئەو عەشیرەتانە دەكات، دوایی دەفەرموێ: هەركامێك لەوانە خوێنی خۆی دەدات، وەهەر كامێك لەو كۆمەڵانە دیلی خۆی بەردەدات [واتە: فیدیە و قەرەبوو دەدا بۆ ئەوەی دیلەكەی بكڕێتەوە] بە شێوەیەكی پەسەند و دادگەرانە لە نێوان ئیمانداران دا.

كەواتە: هەركامێكیان لە ڕووی ئابوورییەوە، خەرجیی و مەسرەفی خۆی لەسەر خۆی بووە، مسوڵمانان هی خۆیان، وە جوولەكە هی خۆیان، وەئەوانی دیكەش هی خۆیان.

٢- لە بەندی (٢٤) دا هاتوە: ( وأنَّ اليَهودَ يُنْفِقونَ مع المؤمنين مادامُوا محاربِينَ ) واتە: وە جوولەکەکان لەگەڵ ئیمانداران دا، پێویستە ماڵی خۆیان صەرف بکەن، مادام بەیەکەوە جەنگ بکەن، لەبەرانبەر دوژمنیان دا.

لێرەدا تەماشا دەکەین، باسی خەرجیی و پارە بەخشینی هاوبەش دەکات لە جەنگ دا، مادام جەنگیان لەگەڵ دوژمنێکی هاوبەشە، بۆ وێنە: کە هێرش دەکرێتە سەر مەدینە، پێویستە بەیەکەوە خەرجیی و مەسرەفی ئەو جەنگە بکێشن.

٣- لە بەندی (٣٧) دا هاتوە: ( وأَنَّ على اليَهودِ نَفَقَتُهم وعلى المسلمين نَفَقَتُهم ) واتە: وە جوولەکە نەفەقەی خۆیان دەکێشن، وەمسوڵمانانیش نەفەقەی خۆیان دەکێشن دیارە ئەگەر وەك ئێستا بووایە، وەزارەتی دارایی (وزارە المالیە) هەبووایە، یاخود وەزارەتی بەرگریی (وزارە الدفاع) هەبووایە، ئەو کاتە دەیگوت: ئەو وەزارەتە ئەو ئەرکە بەئەستۆوە دەگرێ، کە دیارە ئەو کاتە مسووڵمان و نامسوڵمان تێیدا بەشداردەبن.

٤- لە بەندی (٤٥) دا دەفەرموێ: ( على كُلِّ أُناسٍ حِصَّتُهم من جانبِهم الذي قِبَلَهم) واتە: وە هەر کۆمەڵێك ئەو پشکەی خۆیان کە لە لای خۆیانەوەیە، پێویستە بیدەن.

کەواتە: ئەو کاتە دەوڵەتێك بوونی نەبووە، کە لەسەر بناغەی دابەشکردنی کاروبارەکان بە شێوەی دامەزراوەکان و دام و دەزگاکان بەڕێوە چووبێت، وەك لەم ڕۆژگارەی ئێستامان دا هەیە، بەڵکو هەر پێکهاتەیەك لە ڕووی ئابووریی و سەربازیی و کۆمەڵایەتییەوە، کاروباری خۆی بەڕێوە بردوە و تایبەتمەندییەکانی خۆی پاراستوە، وەك لە بەندی (٢٥)دا هاتوە: ( للیَهودِ دِینُهم و للمُسلمینَ دینهم) هەرکامێکیان دینی خۆی و دروشمەکانی خۆی بۆخۆی بەڕێوە بردوە، ئەوە لە ڕووی تایبەتمەندییەکانەوە.

٥- بەڵام لە ڕووی ئامانجە هاوبەشەکانەوە، پێکەوە هاوکار بوون وەك لەبەندی (٣٧)دا هاتوە: ( وأَنَّ بينهُم النَّصرُ على من حارَبَ أهلَ هذهِ الصحيفة) واتە: وە

پێویستە پشگیریی یەکدی بکەن لەبەرانبەر هەر کەسێك دا، کە دژی ئەوانە دەجەنگێ کە صەحیفەیان پێکەوە ئیمزا کردوە.

هەروەها لە بەندی (٤٤) دا هاتوە: (وأَنَّ بينهم النصرُ على مَنْ دَهَم يثرِبَ) واتە: وە پێویستە لە نێوخۆیان دا پشگیریی یەکدی بکەن بەرانبەر هەر کەسێك کە هێرش دەکاتە سەر شاری یەسریب [واتە: مەدینە].

هەروەها لە بەندی (٣٩) دا هاتوە: (وَأَنَّ يَثرِبَ حرامٌ جَوفُها لأهلِ هذهِ الصحيفة) واتە: وە نێو مەدینە قەدەغەیە لە سەر هەرکەسێك کە ئەم صەحیفەیەی ئیمزا کردوە و نابێت شتێك بکات پێچەوانەی هێمنیی و ئاسایشی نێو مەدینە بێ.

٦- هەروەها لە پەیماننامەی نێوان پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) و هۆزی (ثقیف) لە تائیف دا، هاتوە -کە پێشتریش هێنامان- : (ومَنْ كَرِهُوا أَنْ يلِجَ عليهِم من الناسِ فإنهُ لايلِجُ عليهم وان السوقَ و البيعَ بأفنيةِ البيوتِ، وأنهَّ لا يؤمَرّ عليهم الاّ بعضُهم على بَعضٍ )[1].

واتە: وە هەر کەسێك پێیان ناخۆش بێت لە خەڵك کە بچێتە نێو ئەو شار و ناوچەوە کە ئەوان کۆنترۆڵیان کردوە، نابێ بچێ، وە بازاڕ و کڕین و فرۆشتن لە پێش ماڵەکانیانە، [واتە: ئەوە مافیانە کە بازاڕ لە پێش ماڵەکانی خۆیاندا دابنێن] وە نابێ کەس بەسەریانەوە بکرێتە فەرماندە و بەرپرس مەگەر هەندێکیان بەسەر هەندێکیانەوە.

واتە: نابێت غەیری خۆیان بکرێتە بەرپرسیان، ئاوا ڕێککەوتنیان لەگەڵ مسوڵمانان دا کردوە و، پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) ئەوەی قبووڵ کردوە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ئەو کاتە پێکهاتەکانی ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامیی، سەربەخۆ بوون و جۆرێك لە کۆنفیدڕاڵیی هەبووە و، هەرکامێکیان بۆ خۆی کارو باری خۆی بەڕێوە بردوە، بۆیە لە دەوڵەتی مەدینەی پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم) دیار نیە کە نامسوڵمانان پێگە و پۆستێکی

---

(١) الأموال لأبي عبيد، ١٩١.

بەرچاویان پێ سپێردرابێت، لە ڕووی سەربازیی و داراییی و ئیدارییەوە، بۆچی؟ چونکە ئەوان بۆخۆیان کاروباری سەربازیی و داراییی و ئیداریی خۆیان بەڕێوە بردوە و، لەگەڵ مسوڵمانانیش لە ئامانجە هاوبەشەکان و لەئەرکە هاوبەشەکان دا، هاوکار بوون،لەهەموو بوارەکانی: سەربازیی و ئابووریی و، کۆمەڵایەتیی و، پاراستنی هێمنیی و ئاسایش و، چارەسەری کێشە کۆمەڵایەتییەکان دا.

٧- بەڵگەیەکی دیکە لەو بەڵگانە، لەبەندی (٤٥) ی(الصحیفة) دا هاتوە: کە نامسوڵمانان تەنانەت مافی خۆیان بووە - بەتایبەت جوولەکەکان - کە بۆ خۆیان ڕێکەوتننامە بکەن لەگەڵ خەڵکێکی دیکەدا، ئەگەر نامسوڵمانانیش بن، وە با بۆخۆشیان سەربەخۆ بیکەن، وەك فەرموویەتی: ( واذا دُعوا الى صُلحٍ يصالِحونهُ وَيَلبَسونَهُ، فإنَّهم يصالحونهُ وَيلبَسونَه، وأنهم اذا دَعُوا الى مِثلِ ذالِكَ، فإنهُ لهم على المؤمنين الاّ من حارَبَ في الدين ).

واتە: وە هەرکاتێك ئەوانە بانگکران بۆ ئاشتەوایی و بۆ ڕێکەوتننامەیەك کە بچنە نێوی، بۆیان هەیە ئەو ڕێکەوتنامەیە بکەن و پۆشاکی ئەو ڕێکەوتننامەیە بپۆشن، هەروەها خۆشیان ئەگەر دەستپێشخەرییان کرد بۆ ئیمزاکردنی ڕێکەوتننامەیەکی ئاوا، بۆیان هەیە بیکەن و، ئەو مافەیان هەیە لەسەر مسوڵمانان، مەگەر لەگەڵ کەسێك دا کە دژی ئایین بێت. [واتە: دژی دەوڵەتی ئیسلامیی بێت، کە دیارە ئەوکاتە ناگونجێت پێکهاتەیەکی دەوڵەتی ئیسلامیی، لەگەڵ تەرەفێکی دیکەدا کە دژە بەدەوڵەتی ئیسلامیی، ڕێکەوتننامە بکات، چونکە ئەو کاتە وەك گوتراوە: دۆستی دوژمنم دوژمنە.

**چوارەم: زۆرێك لە قسە و فەتوای زانایان، وە هەڵوێست و ڕەفتاری بەرپرسانی دەوڵەتی ئیسلامیی، لەگەڵ نامسوڵمانانی خاوەن پەیمان (أهل الذمة)دا، هەڵقوڵا و و کاردانەوەی ئەو بارودۆخ و هەل و مەرجە سیاسییەیە کە تێیدا ژیاون:**

پێویستە هەمیشە ئەوە لەبەرچاو بگیرێ، کە ئەویش بریتی بووە لە باڵ بەسەرداکێشانی حاڵەتی جەنگ و ڕووبەڕووبوونەوە و کوشتار و دژایەتیی لەنێوان نامسوڵمانان و مسوڵمانان دا، هەروەها هەندێکیش لەو قسە و فەتوا و هەڵوێست و ڕەفتارانە، زادەی تەئویل و تەئویلکاریی وەبەهەڵە لێ تێگەیشتنی هەندێك لە ئایەت و فەرموودەکانە، وەك لە باسی سەرانە (جزیە)دا زیاتر تیشك دەخەینە سەر ئەم بابەتە.

کەواتە: مەرج نیە هەرچی لە کتێبە شەرعییەکان دا هاتوە، بە تایبەتی لە کتێبەکانی سیاسەتی شەرعیی دا، ئیسلام لە هەمووی بەرپرسیار بێت، ئەوەی کە لادان بووە لە ڕێبازی ئیسلام، یان کاردانەوە بووە، واتە: حاڵەتێکی ئاسایی لە ئارادا نەبووە، تاکو زانایانی ئیسلام بەشێوەیەکی ئاسایی فەتوا و بڕیار دەربکەن بۆ چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ نامسوڵمانان دا، بەڵکو حاڵەتێکی نائاسایی لەئارادا هەبووە و، ئەوانیش بڕیار و فەتوای نائاساییان بۆ چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵا نامسوڵمانانی ئەو کاتەدا دەرکردوە.

# بەشی شەشەم

## توێژینەوەیەك لەبارەی سەرانەوە
## سەرانە چییە و چۆن و کەی و
## لە کێ وەردەگیرێ؟!

**بە کورتی دەڵێین:**

وشەی (الجزیة) بە کوردی واتە: (سەرانە) کە باجێك بووە لە تاك تاکی خەڵك وەرگیراوە، کە دیارە ئەوانیش کەسانێك بوون، توانای جەنگ کردنیان بووبێ، وە توانای کەسابەتیان بووبێ، وە نێرینە بووبن، وە قەرزدار نەبووبن و توانای ماددییان هەبووبێ، سەرانە ئەوە پێناسەکەیەتی بە کورتی، ئەو باج (ضریبة)یە کەلە (أهل الذمة) خاوەن پەیمانەکان، وەرگیراوە، چ لەنێو دەوڵەتی ئیسلامیی دا بووبن، چ لەژێر ڕکێفی دەوڵەتی ئیسلامیدا بووبن، لەدەرەوەی بازنەی دەوڵەتی ئیسلامیی.

وە وشەی (جزیة) تەنیا لە یەك ئایەت دا هاتوە و لە یەك شوێن دا، ئەویش ئایەتی ژمارە (٢٩)ی (التوبة)یە، کە ئەمە دەقی ئایەتەکەیە:

﴿ قَٰتِلُواْ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَلَا بِٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَلَا يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَلَا يَدِينُونَ دِينَ ٱلۡحَقِّ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ حَتَّىٰ يُعۡطُواْ ٱلۡجِزۡيَةَ عَن يَدٖ وَهُمۡ صَٰغِرُونَ ﴿٢٩﴾ ﴾

کە لێکدانەوەکەی بەکورتی ئاوایە: لەدژی ئەوانە بجەنگن کە بڕوایان بە خوا و بە ڕۆژی دوایی نیە، وە ئەوەی کە خوا و پێغەمبەرەکەی قەدەغەیان کردوە، بە قەدەغەی نازانن، وە ملکەچ ناکەن بۆ بەرنامەی حەق لەوانەی کەکتێبیان پێدراوە، هەتا بە ملکەچیی سەرانە دەدەن [یانی: ملکەچ دەکەن بۆ دەوڵەتی ئیسلامیی].

ئەم ئایەتە کە تاکە ئایەتێکە وشەی (جزیە)ی تێدا هاتوە، ئەوە دەگەیەنێت کە مسوڵمانان لەسەریان پێویستە، مادام توانایان هەبێت، جەنگ لە دژی ئەوانە بکەن، کە کاتی خۆی کتێبیان لە لایەن خواوە پێدراوە و، دژایەتیی ئیسلام و مسوڵمانان دەکەن و، بڕوایان بە خوا و بە ڕۆژی دوایی نیە، بەو شێوەیەی کە ئیسلام دەڵێت، وەئەوەی کە خواو پێغەمبەری خوا بە قەدەغەیان داناوە، بە

قەدەغەی دانانێن و، ملکەچی ئایینی حەق نابن کە ئیسلامە، هەتا ئامادە دەبن بە ملکەچیی سەرانە بدەن، واتە: ئەوانەی کە جەنگاوەرن و سەنگەر لەمسوڵمانان دەگرن، کەواتە: سەرانە (جزية) تەنیا لەکەسانێك وەردەگیرێ کە لە دژی ئیسلام و مسوڵمانان جەنگ بەرپا دەکەن، پاشان ئامادە دەبن، جەنگیان لە دژ بوەستێنرێ و لەگەڵ ئیسلام و مسوڵمانان دا بکەونە حاڵەتی ئاساییش و تەبایی یەوە، وە سەرانە بدەن بە دەوڵەتی ئیسلامیی.

**کەواتە: بە پێی ئەم ئایەتە:** سەرانەدان، سزای جەنگکردنی ئەو جۆرە کەسانەیە دژی ئیسلام و مسوڵمانان و، نیشانەی ئاشتیی و تەبایی و صوڵح کردنیانە لەگەڵ مسوڵمانان دا، بۆیە دەڵێین: ئەوەی کە هەندێك لە شەرعزانان و زانایان گوتوویانە: حیکمەت و پاساوی سەرانە وەرگرتن لە نامسوڵمانان، ئەوەیە کە مسوڵمان نین و لە بەرئەوەی مسوڵمان نابن، بۆیە سەرانە دەدەن! وە هەندێکی دیکەیان کە دەڵێن: لەبەر ئەوەی نامسوڵمانان بەشداریی ناکەن لەبەرگریی کردن لە وڵات و دەوڵەتی مسوڵمانان، دەبێت سەرانە بدەن!، وە هەندێکی دیکەیان کە دەڵێن: لەبەر ئەوەی نامسوڵمانان زەکات نادەن، بۆیە پێویستە سەرانە بدەن، واتە: سەرانە بەدیلی زەکاتە!، وەهەندێکیشیان کە دەڵێن: لەبەرئەوەی نامسوڵمانان لە ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامیدان، قەرەبووی ئەوە دەدەنەوە، کە ئیسلام ڕێگای داوە کە لە ژێر سایەی دا بژین! ئێمە دەڵێین: هیچ کام لەو چوار پاساوە ( بە بۆچوونی من کە زۆریش لەم بابەتە وردبوومەتەوە ) ڕاست نین، چونکە:

**یەکەم:** ناگونجێ خوای کاربەجێ بەشەریعەتەکەی سزای کەسانێك بدات و سەرانەیان لێ بستێنێ، لەسەر ئەوەی کە مسوڵمان نابن، لە حاڵێك دا کە بۆ خۆی ڕێگای پێداون مسوڵمان نەبن، وەك خوا لە سووڕەتی (الكهف) -٢٩- دا دەفەرموێ:

﴿ وَقُلِ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكُمۡۖ فَمَن شَآءَ فَلۡيُؤۡمِن وَمَن شَآءَ فَلۡيَكۡفُرۡ ... ﴿٢٩﴾ ﴾

واتە: بڵێ: حەق لەپەروەردگارتانەوەیە، کێ حەز دەکات با ئیمان بێنێ، وە کێ حەز دەکات با کافر بێ.

کەواتە: خوا (سُبحانَهُ وَتَعالى) بەشەریعەتەکەی ڕێگای داوە خەڵك کافر بێ، ئەدی ئەو شەریعەتە کە ڕێی داوە خەڵك کافر بێ، چۆن دوایی لەسەر ئەوەی کە کافر دەبن، سزایان دەدات و سەرانە یان لێ دەستێنێ؟! ئەوە ڕاست نیە.

**دووەم:** هەروەها ناگونجێ شەریعەتی خوای دادگەر، لەسەر جەنگ و جیهاد نەکردن نامسوڵمانان سزا بدات و سەرانەیان لێ وەربگرێ، لەحاڵێك دا کە بڕوایان پێی نیە (نامسوڵمان بڕوای بە جیهادی ئیسلامیی نیە و، بڕوای بەوە نیە لەسەر دەوڵەتی ئیسلامیی و ئیسلام خۆی بەکوشت بدات و خەڵك بکوژێ) ئنجا ئایا چۆن لەسەرشتێك کە نامسوڵمانەکە بڕوای پێی نیە، ئیسلام دێت سزای دەدات، وە قەرەبووی لێوەردەگرێ؟!! بێگومان ئەوە شتێکی نەگونجاوە، مسوڵمان کە جەنگ و جیهاد دەکات ئەرکێکی شەرعیی خۆی جێبەجێ دەکات، کە قەناعەتی پێیەتی و بەرگریی لە دینێك و لە قەوارەیەکی سیاسیی و لە کۆمەڵگایەك دەکات، کە بەرامبەریان بەرپرسیارە کە بەرگرییان لێ بکات و خۆییان لەسەر بەکوشت بدات و خەڵکیان لەسەر بکوژێ، بەڵام نامسوڵمانەکە ئەو قەناعەتەی نیە، کەواتە: چۆن لەسەر ئەوە سزای دەدرێ؟!.

**سێیەم:** دیسان ناگونجێ شەریعەتی خوا کەسانێك لەسەر ئەنجامنەدانی یەکێك لە دروشمەکانی مسوڵمانەتیی کە زەکات دانە، سزا بدات، چونکە ئەگەر لەسەر زەکات نەدان سەرانە لە نامسوڵمانان ستێنرابێ، دەبوایە لەسەر نوێژنەکردن بایە، چونکە نوێژ لەپێشترە و گەورەترە لە زەکات، نوێژ سنووری نێوان مسوڵمان و نامسوڵمانە و، نیشانە و دروشمی هەرەزەقی مسوڵمانانە و هەرکەسێك بتەوێ بزانی مسوڵمانە یان نا؟ تەماشا دەکەی نوێژ دەکات یان نا؟ کەواتە: ئەگەر لەسەر جێبە جێ نەکردنی ئەرکێکی ئیسلامیی، خوا سزای نامسوڵمانانی دابایە، دەبوو لەسەر نوێژنەکردن سزای دابانەیە!

**چوارەم:** هەروەها ناشگونجێ شەریعەتی خوای دادگەر قەرەبووی جێکردنەوە و حەوانەوە لە کەسانێك وەربگرێ، کە حەز دەکەن لە ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامییدا بژین و، ببنە هاووڵاتیی دەوڵەتی ئیسلامیی، چونکە ئەوە

پێچەوانەی جوامێرییە، یانی: کەسێك شانازیی بە تۆوە بکات و بڵێت: من دەمەوێ لە پەنای تۆدا و لە سایەی تۆدا بژیم و، ببمە هاووڵاتیی دەوڵەتی تۆ، تۆش بڵێی: باشە، بەڵام دەبێ قەرەبوومان بدەیە!! ئەوە پێچەوانەی ڕووحی شەریعەت و جوامێرییەکە، کە ئیسلام لەسەر مسوڵمانانی پێویست دەکات، کەواتە: هیچ کام لەو شتانەی ڕابردن، نالوێ پاساوی سەرانە وەرگرتن بن و، ڕای هەر ڕاست ئەوەیە کە لە ڕواڵەتی ئایەتەکە دەفامرێتەوە، ئەویش ئەوەیە کە سەرانە سزایەکە بەسەر کەسانێك دا دەسەپێنرێ، کە جەنگیان لە دژی ئیسلام و مسوڵمانان بەرپا کردوە، وە ئامادە نەبوون لەسەرەتاوە ئاشتیی و تەبایی لەگەڵ ئەهلی ئیسلام و دەوڵەتی ئیسلامییدا بکەن، وەك خوا (سُبحانَهُ وَتَعالى) لە ئایەتی: (٦١)ی سووڕەتی (الأنفال)دا دەفەرموێ:

﴿ وَإِن جَنَحُواْ لِلسَّلْمِ فَٱجْنَحْ لَهَا وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٦١﴾ ﴾

واتە: ئەگەر کافرەکان باڵیان بۆ ئاشتیی تەبایی شۆڕکرد، تۆش باڵی بۆ شۆڕ بکە، [ئەگەر مەیلی تەباییان هەبوو، تۆش مەیلی تەبایی بکە]وە پشت بە خوا ببەستە، بێگومان خوا بیسەری زانایە.

( الجصّاص ) خاوەنی کتێبی: ( أحكام القرآن ) لەوبارەوە لە تەفسیری ئایەتی (٢٩)ی ( التوبة ) دانووسیویەتی: ( كانَ مَعقولاً من فحوى الآيةِ وَ مفهومها أن الجِزيةَ مأخوذةٌ مِمَّن كانَ منهم من أهلِ القِتالِ لآستِحالَةِ الخطابِ بالأمرِ بقِتالِ من ليسَ من أهلِ القتالِ )[١].

واتە: ئەوەی لە نێوەڕۆکی ئایەتەکە و لە چەمکەکەی وەردەگیرێ و دەفامرێتەوە، ئەوەیە کە سەرانە لە خاوەن بەڵێن و پەیمانەکان لەوانەیان وەردەگیرێ، کە توانای جەنگیان هەیە، چونکە مەحاڵە فەرمان بەمسوڵمانان بکرێ، کە جەنگ لەدژی کەسانێك بکەن، کە جەنگ ناکەن.

کەواتە: سەرانەش لەکەسانێك وەردەگیرێ، کە جەنگاوەربوون لەدژی ئیسلام و مسوڵمانان، دەنا ئەوانەی کە جەنگیان نەکردوە، وەك ئافرەت و منداڵ و پیر و

---

(١) ج٣ ص١٠٣.

نەخۆش و ئەوانە، سەرانە ڕوو لەوان ناکات،(الجصّاص) دەیەوێ بەڵگە لەسەر ئەوە بێنێتەوە کە سەرانە تەنیا لە جەنگاوەرانی نامسوڵمان وەردەگیرێ، ئەوانەی کە سەنگەریان لە دژی مسوڵمانان گرتوە.

**یەکێك بۆی هەیە بلێ:** ئایا نامسوڵمانان لەدەوڵەتی ئیسلامیی و لەکۆمەڵگای ئیسلامییدا، هیچ بەرپرسیارێتییەکیان لە ئەستۆدا نیە و، هیچ ئەرکێکیان ناکەوێتە سەر شان؟ لەوەڵامدا دەڵێین: با بەرپرسیارێتییان دەکەوێتە سەرشان و، ئەرکیان لەئەستۆدایە، بەرانبەر بە دەوڵەت و کۆمەڵگای ئیسلامیی، وەك لە صەحیفەی مەدینە دا هاتوە، کە لە جێی دەستووری ئێستایە - وەك پێشتر هێنامان - کە ئەوانیش بەرپرسیار بوون لە ڕووی سەربازیی و ئابووریی و هێمنیی و ئاشتیی و کۆمەلایەتییەوە، بەڵێ ئەوانیش بەرپرسیار بوون، بەلام نەك بە پاساوی سزادان و تۆڵەلێکردنەوە، بەڵکو لەسەر بناغەی هاوولاتیی بوون و لەسەر بناغەی بەرپرسیارێتیی هاوبەش.

ئنجا لێرەدا لەچەمك و واتای ئەم ڕستەیە حاڵی دەبین کە خوا دەفەرموێ:

﴿... حَتَّىٰ يُعْطُوا الْجِزْيَةَ عَن يَدٍ وَهُمْ صَاغِرُونَ ﴿٢٩﴾﴾

واتە: تاکو سەرانە دەدەن بە ملکەچیی، کە توێژەرەوانی قوڕئان ئیشکالێکی زل و دڵە ڕاوکێیەکی زۆریان لە چۆنیەتی تەفسیرکردن و تەوجیهکردنی ئەم ڕستە قورئانییەدا بۆ دروست بووە، ئاخر باشە کەسێك کە هاوولاتییە لە ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامیی دا، بۆچی دەبێ بە زەبوونیی و ملکەچیی سەرانە بدات؟! چونکە وشەی ( صاغر) واتە: ملکەچ، (عن يد)یش واتە: ژێر دەستە و لە ژێرحوکمڕانییدا، بەڵێ لێرەدا بۆمان دەردەکەوێ کە مەبەست لەم ڕستە قوڕئانییە، تەسلیمبوونی دوژمنی جەنگاوەر و سەنگەرگرتووە لە ئیسلام و مسوڵمانان، کەسێك کە هەتا دوێنێ سەنگەری لە دەوڵەتی ئیسلامیی گرتوە و خوێنی مسوڵمانانی ڕشتوە، ئەوکەسە پێویستە ئێستا بە شێوەیەك سەرانەکە بدات، کە ملکەچیی پێوە دیاربێ، کەلەمەودوا بەرانبەر بەدەوڵەتی ئیسلامیی چەکی دوژمنایەتیی بەشان دا ناکات و، بڕیاری داوە کە تەبا و ئاشت بێ لەگەڵ دەوڵەتی ئیسلامییدا، نەك

هەرکەسێك کە دوایی بە حەق یان بەناحەق، سەرانەی لێوەرگیراوە، وەك دوایی باسی دەکەین.

**ئەگەر یەکێك بپرسێ:** ئەدی بۆچی لە چەندان بەسەرهات لە مێژووی دەوڵەتی ئیسلامییدا هاتوە، بەڕاشکاویی ئەوە دەگەیەنن کە سەرانە ( جزية ) لەبەرامبەر پارێزگاریی کردنی دەوڵەتی ئیسلامیی لە هاووڵاتییانی نامسوڵمانی دا، وەرگیراوە، وەهەرکات دەوڵەتی ئیسلامیی توانای پارێزگارییکردنی لە هاووڵاتییانی نامسوڵمانی نەبووبێ، ئەوە سەرانەکەی بۆ گێڕاونەتەوە.

هەروەها هەرکات نامسوڵمانان بەشداریی جەنگ و جیهادیان کردبێت، سەرانەیان لەسەر هەڵگیراوە؟!

کەواتە قسەی ئەو شەرعزانانە ڕاستەلئنجا وێڕای ئەوەش کە ڕابرد (سێر تۆماس ئەرنۆڵد ) لە کتێبی ( الدعوة الى الإسلام ) - کە دیارە تەرجەمەی عەرەبیی کراوە - واتە: [بانگەواز بۆ ئیسلام]دا، چەند قسەیەکی هێناون، کە ئێمە قسەکانی بەدەقە عەرەبییەکەیان دەگوازینەوە و، پاشان دەیانکەینە کوردیی و، دوایی وەڵامی ئەو پرسیارەش دەدەینەوە، کە لەسەرەوە ورووژاندمان، گوتوویەتی:

{ولم يكن الغرض من فرْض هذه الضريبة على المسيحيين - كما يريدها بعض الباحثين على الظن - لونًا من ألوان العقاب لامتناعهم عن قَبُول الإسلام، وإنما كانوا يؤدونها مع سائر أهل الذمة وهم غير المسلمين من رعايا الدولة الذين كانت تَحُولُ ديانتهم بينهم وبين الخدمة في الجيش، في مقابل الحماية التي كفَلتها لهم سيوف المسلمين، ولما قدَّم أهل الحيرة المال المُتَّفق عليه، ذكروا صراحةً أنهم إنما دفعوا هذه الجزية على شريطة أن يمنعها أميرهُم، حين البغي من المسلمين وغيرهم} الطبري ج١ ص٢٠٥٥.

{وكذلك حدث أن سجَّل خالدٌ في المعاهدة التي أَبْرَمَهَا مع بعض أَهالي المدن المجاورة للحيرة قوله: (( فإِنْ منعناكم فَلَنَا الجزيةُ، وإلاّ فلا} الطبري، ج١ص٢٠٥٠.

{ويمكن الحكم على مدى آعتراف المسلمين الصريح بهذا الشرط من تلك الحادثة التي وقعت في عهد الخليفة عمر لما حَشَد الإمبراطورهرقل جيشاً ضَخماً لِصَدِّ قوات المسلمين المحتلَّة، كان لِزاماً على المسلمين -نتيجة لما حدث- أن يركزوا كلَّ نشاطهم في المعركة

التي أَحْدقَتْ بهم، فلما عَلم بذلك أبو عبيدة قائد الحرب، كتب الى عُمّال المدن المفتوحة في الشام، يأمرهم بَرِدِّ ما جُبيَ من الجزية من هذه المدن، وكتب الى الناس يقول: إنَّما ردَدْنا عليكم أموالكم لأنه بَلَغنا ما جُمِع لنا الجموعُ، وأنكم قد آشترطتم علينا أن نَمْنَعكم وإناّ لانَقْدِرُ على ذلك، وقد رَددْنا عليكم ما أَخَذنْا منكم، ونحن لكم على الشرط وما كتبنا بيننا وبينكم إنْ نَصَرَنا الله عليهم، وبذلك رُدَّتْ مبالغُ طائَلة من مال الدولة، فَدعا المسيحيون بالبركة لرؤساء المسلمين وقالوا: (( رَّدكُم الله علينا ونصركم عليهم (أي على الروم) فلو كانوا هم، لم يردّوا علينا شيئاً، وأَخذوا كلَّ شيءٍ بقيِ لنا} الخراج لأبي يوسف، ص٨١.

{وقد فُرِضَتْ الجزيةُ -كما ذكرنا- على القادرين من الذكور مقابل الخدمة العسكرية التي كانوا يُطالَبون بها، لو كانوا مسلمين، ومن الواضح أن أيَّ جماعة مسيحيّة كانت تُعْفى من أَداءِ هذه الضريبة، اذا ما دخلت الجيشَ الإسلامي، وكانت الحال على هذا النحو مع قبيلة (الجراجمة) وهي مسيحية كانت تقيم بجوار أَنطاكية، سالَمتِ المسلمين وتعهَّدتْ أن تكون عَوناً لهم، وأن تُقاتِل معهم في مغازيهم على شريطة ألاّ تُؤْخَذَ بالجزية، وأن تُعْطي نَصِيبَها من الغنائم} ( البلاذي - فتوح البلدان-، ص١٥٩.

{ولما آندفعت الفتوحُ الإسلامية الى شمال فارس، سنةِ (٢٢هـ) أُبْرِمَ مثلُ هذا الحِلْفُ مع إحدى القبائل التي تُقيم على حدود تلك البلاد، وأُعْفيتْ من أَداءِ الجزية، مُقابِلَ الخدمةالعسكرية} الطبري ج١ص٢٦٦٥.

{ونجد أَمثلة شبيهة بهذه، للإعفاءِ من الجزية في حالة المسيحيين الَّذين عملوا في الجيش أو الأُسطول في ظلِّ الحكم التركي...][1].

واتە: وە مەبەست لە پێویستکردنی ئەم باجە لەسەر مەسیحییەکان - وەك هەندێ لە لێکۆڵەرەوان دەیانەوێ ئەو گومانە ببەین - مەبەست پێی جۆرێك لەسزادان نەبووە لە بەرانبەر ئەوەدا، کە مسوڵمان نەبوون، بەڵکو سەرانەیان داوە لەگەڵ باقی ئەوانەی کە بوونە هاوپەیمانی دەوڵەتی ئیسلامیی [ واتە: نامسوڵمانانی ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامیی] کە دینەکەیان ڕێی لێ گرتوون بچنە نێو سوپای

---

(١) الدعوة الى الإسلام، ص.

ئیسلامەوە، وە لە بەرانبەر ئەوەدا کە شمشێرەکانی مسوڵمانان بەرگریی لێکردوون، ئەوانیش لەبەرانبەر ئەوەدا سەرانەیان داوە، وە کاتێك خەڵکی (حیرة) ئەو ماڵەی کە لەسەری ڕێککەوتبوون، دایان، [واتە: سەرانەکەیان دا] بە ڕاشکاویی باسیان کردوە، کە ئەو سەرانەیە بەو مەرجە دەدەن، کە فەرماندەی مسوڵمانان بەرگرییان لێ بکات، لەبەرانبەر ستەمی مسوڵمانان و نامسوڵمانانیش دا.

هەروەها کاتێك (خالیدی کوڕی وەلید) ئەو پەیماننامەیەی مۆر کرد لەگەڵ هەندێك لەو شارانەی دەوروبەری (حیرة)دا، لە پەیماننامەکەی( خالید) دا هاتوە: (فإن منعناكُم فلنا الجزيةُ، و إلاّ فلا) واتە: ئەگەر بەرگرییمان لە ئێوە کرد و نەمانهێشت دەستدرێژییتان بکرێتە سەر، ئەوە سەرانەمان دەکەوێ، ئەگەرنا سەرانەمان ناکەوێ.

وە دەگونجێ حوکم بدەین کە مسوڵمانان زۆر بەڕاشکاویی دانیان بەو مەرجەدا هێناوە لەو ڕووداوەدا کە لە سەردەمی (خەلیفە عومەر) دا خوالێی ڕازی بێت ڕووی دا، کاتێك کە ئیمپراتۆر (هیرەقل) سوپایەکی گەورەی کۆکردبۆوە بۆ بەرپەرچدانەوەی مسوڵمانانی کە شامیان گرتبوو، کە بە پێی ئەو ڕووداوە لەسەر مسوڵمانان پێویست بوو، هەموو توانای خۆیان بخەنە گەڕ، بۆ ئەو جەنگە کە یەخەی پێگرتوون، ئنجا کاتێك ئەبو عوبەیدەی جەڕڕاح فەرماندەی عەرەبەکان (فەرماندەی مسوڵمانان، کە دیارە زۆربەیان عەرەب بوون) بەوە دەزانێ، بۆ بەرپرسانی شارە ئازادکراوەکانی شام دەنووسێ و، فەرمانیان پێ دەکات کە هەرچی سەرانەی کۆیان کردۆتەوە لە خەڵکی ئەو شارانە، بۆیان بگێڕنەوە، وە بۆ خەڵك دەنووسێت: (إنَّما ردَدْنا عليكم أموالكم، لأنه بلَغَنا ما جُمِع لنا الجموعُ، وأنّكم قد آشترطتم علينا أن نمنعكُم وأنّا لا نَقْدِرُ على ذالِك، وَقَد رَدْدنا عليكم ماأَخَذْنا منكم، ونحن لكم على الشَّرط وما كتبنا بيننا وبينكم، إنْ نَصَرَنا اللهُ عليهم).

واتە: بۆیە ماڵەکانتانمان بۆ گێڕانەوە و سەرانەکانمان پێ دانەوە، چونکە پێمان گەیشتوە، سوپایەکی زۆرمان بۆ کۆکراوەتەوە، وە ئێوەش لەسەر ئێمەتان کردۆتە مەرج کە بەرگرییتان لێ بکەین، وە ئێمەیش توانای ئەوەمان نیە، بۆیە ئەوە ماڵەکانمان پێدانەوە، وە ئێمە ئەو مەرجەی کە لەسەرتان گرتووین، پابەندین بەو

مەرجەوە [کە مادام ناتوانین دیفاعتان لێ بکەین نابێ سەرانەتان لێوەربگرین]، وە پابەندین بەوەوە کە بۆمان نووسیون، ئەگەر خوا بەسەر دوژمن دا سەری خستین، ئێمە هەر لە سەر مەرجی خۆمانین [واتە: بەرگرییتان لێدەکەیین وە سەرانەشتان لێوەردەگرین، بەڵام ئێستا کە نازانین، داخۆ دەتوانین بەرگرییتان لێ بکەین یان نا؟ بۆمان نیە سەرانەتان لێوەربگرین]، بەو شێوەیەش ئەندازەیەك ماڵی زۆر کە دەوڵەتی ئیسلامیی وەری گرتبوو، گێڕدرایەوە بۆ نامسوڵمانان، بۆیە مەسیحییەکان دوعای بەرەکەت و هێزیان بۆ سەرکردەکانی مسوڵمانان کرد، وە گوتیان: ( رَّدَكمُ اللهُ علينا ونَصَرَكُم عليهِم -أي على الرُّومِ - فلَو كانوا هم لم يُرُدُّوا علينا شيئاً، وَأخَذُوا كلَّ شيئٍ بقيَ لنا ) خوا ئێوە بگێڕێتەوە بۆ لای ئێمە، وە ئێوە بەسەر ڕۆمەکان دا سەر بخات، ئەگەر ئەوان بوونایە ئەو باجەی کە لێیان وەرگرتووین، هیچیان بۆ نەدەگێڕاینەوە و، چیشمان هەیە هەموویان لێ دەستاندین.

وە سەرانە پێویست کراوە لەسەر ئەو نێرینانەی کە بە توانا بوون، لەبەرانبەر ئەوەدا کە خزمەتی سەربازییان بۆ نەکراوە، کە ئەگەر مسوڵمان بوونایە، دەبوو سەربازییان بکردایە، وە شتێکی ئاشکراشە کە هەرکۆمەڵێکی مەسیحیی چاوپۆشیی لێ دەکرا، لەو سەرانەیە، ئەگەر چووبایە نێو سوپای ئیسلامەوە، [واتە: مادام بەشداریی جەنگ و جیهادیان کردبایە، ئەوە سەرانەیان لەسەر هەڵدەگیرا، مەسیحییەکان وە غەیری مەسیحییەکانیش].

هەروەها حاڵ هەر بەو شێوەیە بووە لەگەڵ قەبیلەی جەڕاجیمە -کە هۆزێکی مەسیحیی بوون لە نزیك شاری ئەنتاکیە نیشتەجێ بوون - کە لەگەڵ مسوڵمانان دا چوونە حاڵەتی صوڵح و ئاشتییەوە، وە پەیمانیشیان دا کە یارمەتی مسوڵمانان بدەن، وە لە جەنگەکانیش دا هاوکاری مسوڵمانان بن، وە لەگەڵیان بچنە جەنگ لە دژی دوژمنەکانیان، بەمەرجێك کە سەرانەیان لێوەرنەگیرێ و لە دەستکەوتی جەنگیشیان بدرێتێ.

وە کاتێك کە هێزی ڕزگاریخوازیی ئیسلامیی بەرەو باکووری فارس ڕۆیی، لە ساڵی (٢٢) کۆچییدا، پەیمانێکی بەمشێوەیە ئیمزاکرا، لەگەڵ یەکێك لە هۆزەکانی ئەوێدا، کە لە سەر ئەو سنوورە نیشتەجێ بوون و لە سەرانە عەفوو

کران، لە بەرانبەر ئەوەدا کە خزمەتی سەربازیی بکەن [واتە: بچنە نێو سوپای ئیسلامەوە] دوایی (ئەرنۆڵد ) دەڵێت: هەروەها وێنەی ئەم پەیمانانە زۆر دەبینرێ، کە کاتێك مەسیحییەکان ( دیارە ئەو باسی مەسیحییەکان دەکات، ئەگەرنا جوولەکەش بوون، یان خاوەنی هەر ئاینێکی دیکەش بوون، هەروا بووە، ئەوانەی کە ئامادەبوون ببنە هاوپەیمانی مسوڵمانان و لەگەڵ دەوڵەتی ئیسلامییدا تەبا بن و لە ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامییدا بژین) مادام ئامادەبوون بچنە نێو سوپاوە، یاخود لە سوپای دەریایی کە لە سەردەمی دەستەڵاتی عوسمانییدا بووە، بەشداربن، ئەو نامسوڵمانانە هەموویان لە سەرانە عەفوو کرابوون].

**کەواتە ئێستا دەڵێین:**

لە ڕاستییدا هیچ تێکگیرانێك لە نێوان قسەکەی ئێمە و ئەو حاڵەتەدا نیە، چونکە ئەوانە ( ئەو میللەت و کۆمەڵە نامسوڵمانانە) لەسەرەتاوە بە هۆی ئەوەوە کە لە بەرەی دوژمنانی جەنگاوەر دژی ئیسلام و مسوڵمانان دا بوون، پاشان ملیان داوە بۆ ئاشتیی، بۆیە سەرانەیان لێوەرگیراوە، بەڵام:

١- کاتێك دەوڵەتێك نەتوانێ بەرگریی لە هاووڵاتییانی بکات، ڕەوانیە شانیان بە باج قورس بکات.

٢- وە کەسانێکیش ئامادەبوون ببنە سەربازی دەوڵەتی ئیسلامیی، دادگەریی و جوامێریی ئیسلامەتیی وا دەخوازێت کە سەرانەیان لەسەر هەڵبگیرێ، چونکە لە ئەصڵ دا وەك سزایەك لەسەریان پێویست کراوە، سزای ئەوە کە دژی ئیسلام و مسوڵمانان و دژی دەوڵەتی ئیسلامیی جەنگاون، کەواتە: ئێستا کە ئامادەن بێنە نێو سوپای ئیسلامەوە، شایستەی ئەوەن کە خەڵات بکرێن، نەك سزا بدرێن.

**لەمەشەوە کە ڕابرد دەگەینە ئەم ئەنجامگیرییە گرنگە.**

دەوڵەتێکی ئیسلامیی کە لەم ڕۆژگارەدا (ڕۆژگاری ئێستای ئێمەدا) دادەمەزرێ و شەریعەت پیادە دەکات، بەپێچەوانەی تێگەیشتنی هەندێك کەسەوە، نەك هەر مولزەم نیە، بەڵکو بۆیشی نیە سەرانە لەو نامسوڵمانانە وەربگرێ، کە

لە ژێر سایەی دا دەژین، چونکە لە مێژە ئەو نامسوڵمانانە ( ئنجا جوولەکەن، نەصرانیین، بووژایین، هەرچی هەن) لەسەر بناغەی هاووڵاتیی بوون بڕیاری ژیانیان لە ژێر سایەی ئەو کۆمەڵگا و دەوڵەتە ئیسلامییەدا داوە، وە ئایەتی ژمارە (٢٩)ی سوورەتی (التوبة)یان بەسەردا ناچەسپێت، چونکە ئەوانە لە دژی ئیسلام و دەوڵەتی ئیسلامیی نەجەنگیون، تاکو دروست بێت بەو جۆرە مامەڵەیان لەگەڵ دا بکرێ و ئەو سزادارایییەیان بەسەردا بچەسپێت، بەڵکو پێویستە وەك هاووڵاتیی ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامیی مامەڵەیان لەگەڵ دا بکرێ.

# سێ ڕوونكردنەوەی گرنگ
# لەبارەی سەرانەوە

**ئێستاش سێ ڕوونكردنەوەی دیكە، دەربارەی سەرانە(الجزية)، دەخەینەڕوو:**

**یەكەم:** ئایا دروستە وشەی (جزیە) كە بە كوردیی (سەرانە)ی پێ دەگوترێ، بگۆڕێ؟!

**دووەم:** سەرانە وەرگرتن، مەرجی هەموو پەیمان لێوەرگیرانێك نیە، واتە: مەرج نیە هەموو ئەوانەی كە پەیمان دەدەن بە دەوڵەتی ئیسلامیی و، دەبنە خاوەن پەیمان (أهل العهد)، سەرانەیان لێوەربگیرێ، بە واتایەكی دیكە: سەرانە لێوەرگیران مەرجی هاووڵاتی بوون نیە، لە كۆمەڵگا و دەوڵەتی ئیسلامییدا.

**سێیەم:** مەرج نیە هەر ماڵ و سامانێك لەلایەن دەوڵەتی ئیسلامییەوە، لە نامسوڵمانانێك كە ملكەچی بوون، وەربگیرێ، بەسەرانە دابنرێ.

## ڕوونكردنەوەی یەكەم: گۆڕینی وشەی ( جزية ):

وشەی (الجزية) - پێشتریش باسمان كرد - كە تەنیا لەیەك ئایەتی قورئان دا هاتوە، كە ئایەتی ژمارە (٢٩)ی سووڕەتی ( التوبة )یە، ئنجا ئایا كاتێك ئەو سەرانەیە وەردەگیرێ لە كەسانێك كە دروستە سەرانەیان لێوەر بگیرێ، دروستە ناوەكەی بگۆڕدرێ، بۆ وێنە: بە باج (ضريبة) یان بە صەدەقە، یان زەكات، یان بە هەر وشەیەكی دیكە، یان نا؟ لە وەڵام دا دەڵێین: لەوبارەوە زانایان و

شەرعزانان ڕا جیاییان هەیە، بەڵام زۆربەیان ئەگەر نەڵێم هەموویان، لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە: بەڵێ دروستە، ئەویش بە بەڵگەی ئەوە کە (عومەری کوڕی خەتتاب) خوا لێی ڕازی بێ، دووەم جێنشینی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە سەردەمی جێنشینایەتیی خۆیدا، لە یەکێ لە هۆزە نەصرانییەکانی عەرەب، کە ( بني تغلب )یان پێگوتراوە، ئامادەبووە، کە سەرانەیان لێوەربگرێ، بەبێ بەکارهێنانی وشەی ( جزية ).

با لەو بارەوە ئەم دەقە بێنینەوە: {قَالَ الشَّافِعِيُّ: عُقَيْبَ هَذَا الْحَدِيثِ وَهَكَذَا حَفِظَ أَهْلُ الْمَغَازِي وَسَاقُوهُ أَحْسَنَ مِنْ هَذَا السِّيَاقِ فَقَالُوا: رَامَهُمْ عَلَى الْجِزْيَةِ فَقَالُوا نَحْنُ عَرَبٌ لاَ نُؤَدِّي مَا يُؤَدِّي الْعَجَمُ وَلَكِنْ خُذْ مِنَّا كَمَا يَأْخُذُ بَعْضُكُمْ مِنْ بَعْضٍ يَعْنُونَ الصَّدَقَةَ فَقَالَ عُمَرُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ: لاَ هَذَا فَرْضٌ عَلَى الْمُسْلِمِينَ فَقَالُوا : فَزِدْ مَا شِئْتَ بِهَذَا الاِسْمِ لاَ بِاسْمِ الْجِزْيَةِ فَفَعَلَ فَتَرَاضَى هُوَ وَهُمْ عَلَى أَنْ ضَعَّفَ عَلَيْهِمُ الصَّدَقَةَ ويُروى أنهُ قالُ: هؤلاء القومُ حُمْقى، رضوا المعنى وَ أبوا الإسم} أخرجه البيهقي في السنن الكبرى ، ج٢ص٢١٦.

(بيهقى ) دەڵێت: (شافعى ) ڕەحمەتی خوای لێبێت لە دوای ئەم فەرموودەیە گوتوویەتی: ئەوانەی کە باسی جەنگەکانی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) یان کردوە، ئەم دەقەیان هێناوە، بەشێوەیەکی جوانتر لەوە هێناویانە (واتە: ئەو بەسەرهاتەی کە عومەر خوا لێی ڕازی بێت ئامادەبووە سەرانە وەربگرێ لە (بەنی تەغلیب) بێ ئەوەی وشەی جیزیە یان بۆ بەکاربێنێت) گوتوویانە: عومەر خوای لێی ڕازی بێ مامەڵەی لەگەڵ دا کردن کە سەرانەیان لێوەربگرێ، ئەوانیش گوتیان: ئێمە خەڵکێکی عەرەبین و ئەوەی کە عەجەم [واتە: غەیری عەرەب] بەناوونیشانی سەرانە دەیدەن، ئێمە نایدەین، بەڵام وەك چۆن ئێوە هەندێکتان لە هەندێکتان وەردەگرن [مەبەستیان پێی زەکات بوو] ئەوەش لە ئێمە وەربگرە، عومەر خوا لێی ڕازی بێت گوتی: نەخێر ئەوە فەرزی مسوڵمانانە، [واتە: مسوڵمانان لە سەریان فەرزە کە زەکات بدەن و ناوونیشانی زەکات و صەدەقە بۆ مسوڵمانان بەکاردێ و، ئێوە مسوڵمان نین و لە ژێر ناوونیشانی زەکات دا لێتان وەرناگرین] گوتیان: ئەوەندەی لێمان وەردەگری بە ناوی زەکات، لێمان وەربگرە، بەڵام با بەناوی سەرانەوە نەبێ، (عومەر)یش وایکرد و ڕێککەوتن

کە زەکاتیان بۆ دوو چەندان بکاتەوە، [بۆ وێنە: ئەگەر دە دینار لە مسوڵمانێك وەربگرێ، ئەوان بیست دینار بدەن]، بەڵام وشەی جیزیەیان بۆ بەکارنەهێنێت،وە گێڕدراوەتەوە کە عومەر خوا لێی رازی بێت لەو بارەوە گوتوویەتی: ئەوانە کەسانێکی نەفامن، بەماناکەی ڕازین، بەڵام بەناوەکەی ڕازی نین، [واتە: بەنێوەرۆکەکەی کە بریتیە لەوە ئەندازەیەك ماڵ بدەن بە دەوڵەتی ئیسلامیی ڕازین، بەڵام پێیان خۆش نیە ناوەکە بەکاربهێنرێ].

لەمەوە شەرعزانان هەڵیان هێنجاوە کە ئەوە بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکرایە کە دەگونجێ ئەو ناوە بەکارنەهێنرێ، چونکە خۆ ئەوە شتێکی پەرستشانە (تَعبُّدي)نیە و لە بواری هەڵسوکەوتەکان دایە، لە بواری هەڵسوکەوتەکانیش دا، تەماشای بەرژەوەندیی دەکرێ، بەرژەوەندییەکەش بەوە دێتە دی، ئەو خەڵکەی سەرانەیان دەکەوێتە سەر، ئەو ئەندازە ماڵە بدەن، ئیدی خۆیان چ ناوێکی لێ دەنێن، ئەوە ئیشکالی تێدا نیە.

### دووەم: سەرانەدان مەرجی هەموو پەیمان بەستنێك نیە لە نێوان دەوڵەتی ئیسلامیی و هاووڵاتییانی نامسوڵمان دا:

هەندێك کەس وادەزانێ هەر نامسوڵمانێك لە سایەی دەوڵەتی ئیسلامیی دا ژیا، دەبێ سەرانە بدات، بەڵام ئەمە وانیە، واتە: ئەهلی زیممە بوون - کە پێشتر باسمان کرد (الذمة) واتە : پەیمان - هاوپەیمانبوون لەگەڵ دەوڵەتی ئیسلامیی دا، نەبەستراوەتەوە بەوەوە کە حەتمەن دەبێ سەرانە بدرێ و، ئەو دووە دوو شتی پێکەوە پەیوەست و تێکەڵکێش نین، بەڵکو دەگونجێ کەسانێك هاووڵاتیی دەوڵەتی ئیسلامیی بن و، سەرانەش نەدەن، وە ئەمە لە ڕۆژگاری پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)یش دا بووە، واتە: لەو دەوڵەتەدا کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بنیاتی ناوە و بەڕێوەی بردوە، وە لە ڕۆژگاری خەلیفە ڕاشیدەکانیش دا خوا لێیان ڕازی بێ و، لەڕۆژگاری دوای خەلیفە ڕاشیدەکانیشدا وا بووە و، کە کەسانێك بوون لە سایەی دەوڵەتی ئیسلامییدا ژیاون، یاخود لەگەڵ دەوڵەتی ئیسلامییدا بەڵێن و پەیمانیان بووە،

چ لەچوارچێوەی دەوڵەتی ئیسلامییدا بن، چ لە دەرەوەی ئەو چوار چێوەیەدا، وە سەرانەشیان نەداوە، ئنجا ئێمە لەو بارەوە چوار بەڵگە دێنینەوە :

### ١- بەڵگەی یەکەم:

ڕێککەوتننامەی نێوان پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) و جوولەکەکانی مەدینە:

(وەك پێشتر باسمان کرد) سێ هۆزی سەرەکی جوولەکە لە مەدینەدا هەبوون، لە ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامییدا کە ( بنو قينقاع وبنو النضير وبنو قريظة) بوون پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئەو صەحیفەیەی کە وەك دەستووری ئەم ڕۆژگارەی ئێستا وابووە، لەگەڵ ئەوان و موشریکەکان و، لە نێوان مسوڵمانان دا ئیمزا کرد، کە ئەرك و کاری سەرجەم پێکهاتەکانی ئەو دەوڵەتە ئیسلامییەی بە مسوڵمان و نامسوڵمانەوە، تێدا خرابوونە ڕوو، وە لەوێدا هیچ باسی سەرانەی تێدا نیە.

أ- لەوبارەوەش (إمام شافعی) ڕەحمەتی خوای لێبێت، لە کتێبی ( الأم )دا کە هی خۆیەتی گوتوویەتی: ( لَم أعلَمْ مُخالِفاً من أهلِ العِلمِ بالسِّيَرِ أَنَّ رسولَ اللهِ لمّا نَزَلَ المَدينةَ وادَعَ يهودَ كافةً على غيرِ جِزيةٍ )[1].

واتە: نەمزانیوە هیچ کەسێك ڕای جیاواز بێت، لەوانەی کە شارەزان بە سیرە و ژیانی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) کە کاتێك پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) چۆتە مەدینە، لەگەڵ تێکڕای جوولەکەکان دا، بەبێ سەرانە وەرگرتن، پەیمانی بەستوە.

واتە: سەرانە وەرگرتن مەرجی ئەو پەیمانە نەبووە کە لەگەڵ نێوان پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) و مسوڵمانان لە لایەك، وە جوولەکەکانیش لە لایەکی دیکە دا، بەستراوە.

---

(١) الأم، ج٩ ص١٧٣.

ب- (إبن تیمیه)یش لەو بارەوە لە کتێبی: ( الصارمُ المسلول على شاتم الرسول )دا گوتوویەتی:( النبيُّ لَمّا قَدِمَ المدينةَ وادَعَ جميع اليهودِ الذين كانوا بِها موادعةً مُطلَقَلةً ولم يَضرِبْ عليهم الجِزيةَ، و هذا مَشهورٌ عِندَ أهلِ العِلمِ بِمَنزِلَةِ التواترُ بينهم )[1].

واتە: کاتێك پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) چووە مەدینە، لەگەڵ سەرجەم جوولەکەکان دا پەیمانی بەست، ئەوانەی کە لە مەدینەدا بوون، پەیمانبەستنێکی ڕەها، [واتە: بۆچەند ساڵێك نەبووم] وە هیچ سەرانەشی لە سەر پێویست نەکردن، ئەوە شتێکی زانراوە لە نێوان زانایان دا بە شێوەیەك کە وەك تەواتورە.

**٢- بەڵگەی دووەم:**

لەوبارەوە کە مەرج نیە هەموو ئەوانەی کە لە دەوڵەتی ئیسلامییدا دەژین لە نامسوڵمانان، سەرانەیان لێوەربگیرێ، ئەوەیە کە ئەوانەی ئاشتیی یاخود بێلایەنیی (الحیاد) هەڵدەبژێرن، لەگەڵ دەوڵەتی ئیسلامییدا، پێویستە دەوڵەتی ئیسلامیی هەڵوێستی ئیجابیی بێ لەگەڵیاندا، وەبەمەرج نەگیراوە هیچ پارە و ماڵ و سامانێکیان لێوەربگیرێ، بۆ وێنە:

أ- لەو بارەوە خوای پەروەردگار لە سوورەتی (الأنفال ) -٦١- دا دەفەرموێ:

﴿ وَإِن جَنَحُواْ لِلسَّلۡمِ فَٱجۡنَحۡ لَهَا وَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ﴿٦١﴾ ﴾

واتە: ئەگەر ئەوان [واتە: کافران] باڵی ئاشتییان شۆڕ کرد، یاخود مەیلی ئاشتییان هەبوو، تۆش مەیلی ئاشتیی بنوێنە، وە پشت بەخوا ببەستە، بێگومان خوا بیسەری زانایە.

واتە: مادام ئەوان چاویان لە ئاشتیی بێ، تۆیش ئاشتییان لەگەڵ دا بکە، ئیدی هیچ باسی سەرانە لەئارادانیە.

---

(١) ص٦٢.

**ب-** هەروەها لە سوورەتی (النساء) -٨٩ و٩٠- دا، خوا (سُبحانَهُ وَتَعالى) دەربارەی مامەڵەکردن لەگەڵ نامسوڵمانان دا، لە پێش دا، ئەوانەی کە دژایەتیی ئەهلی ئیسلام دەکەن و دوایی ئەوانە کە بێلایەن دەبن، دەفەرمویٚ:

﴿...فَإِن تَوَلَّوْاْ فَخُذُوهُمْ وَٱقْتُلُوهُمْ حَيْثُ وَجَدتُّمُوهُمْ ۖ وَلَا تَتَّخِذُواْ مِنْهُمْ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴿٨٩﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ يَصِلُونَ إِلَىٰ قَوْمٍ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُم مِّيثَٰقٌ أَوْ جَآءُوكُمْ حَصِرَتْ صُدُورُهُمْ أَن يُقَٰتِلُوكُمْ أَوْ يُقَٰتِلُواْ قَوْمَهُمْ ۚ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَسَلَّطَهُمْ عَلَيْكُمْ فَلَقَٰتَلُوكُمْ ۚ فَإِنِ ٱعْتَزَلُوكُمْ فَلَمْ يُقَٰتِلُوكُمْ وَأَلْقَوْاْ إِلَيْكُمُ ٱلسَّلَمَ فَمَا جَعَلَ ٱللَّهُ لَكُمْ عَلَيْهِمْ سَبِيلًا ﴿٩٠﴾﴾

واتە: ئنجا ئەگەر پشتیان هەڵکرد، بیان گرن و بیانکوژن لە هەرشوێنێك بەریەلتان کەوتن، وە هیچ کەسێك لەوان مەکەنە دۆست و یارمەتی دەری خۆتان. لە پێشدا خوا (سُبحانَهُ وَتَعالى) بە گشتی دەفەرمویٚ: ئەو کافرانەی کە پشتتان تیٚ دەکەن و ئامادە نین لەگەڵتاندا ئاشتیی بنوێنن، وە لەسەر جەنگ لە دژکردنتان بەردەوام بن، لە هەر شوێنێك بەریەلتان کەوتن بیانگرن و بیانکوژن، وە هیچ کەسێکیان لە نێو دا مەکەنە دۆست و یارمەتیدەر و پشتیوانی خۆتان، دوایی خوا (سُبحانَهُ وَتَعالى) دوو جۆرە کۆمەڵی کافران لەوە جیا دەکاتەوە:

**جۆری یەکەم:**

﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ يَصِلُونَ إِلَىٰ قَوْمٍ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُم مِّيثَٰقٌ ...﴾

واتە: جگە لە کەسانێك کە پەیوەستن بە کۆمەڵێکەوە، کە لەنێوان ئێوە و ئەو کۆمەڵەدا پەیمان هەیە ( وەك پێشینان دەڵێن: دۆستی دۆستم دۆستمە) واتە: کۆمەڵێك هەن، هۆزێکە، حیزبێکە، کەسانێکن لە کافرەکان، ڕاستەوخۆ لەگەڵ ئێوەدا هیچ پەیوەندییەکیان نیە، بەڵام پەیمانیان لەگەڵ کۆمەڵێکی دیکەی کافر دا هەیە، کە ئەو کۆمەڵە کافرەی دیکە، لەگەڵ ئێوەدا هاوپەیمانن، ئێوەش دەبێت لەگەڵ هاوپەیمانی هاوپەیمانەکانتان دا، ئاشتیی بنوێنن و، نابێت جەنگیان لەگەڵ دا بکەن.

جۆری دووەم:

﴿أَوۡ جَآءُوكُمۡ حَصِرَتۡ صُدُورُهُمۡ أَن يُقَٰتِلُوكُمۡ أَوۡ يُقَٰتِلُواْ قَوۡمَهُمۡ ...﴾

یاخود- هاوپەیمانی هاوپەیمانتان نین و، دۆستی دۆستەکانتان نین- بەڵام هاتوون بۆلاتان: سینەیان تەنگە کە لە دژی ئێوە بجەنگن، یاخود لە دژی قەومەکەی خۆیان بجەنگن، واتە: کۆمەڵێکی کافرن، پێیان خۆش نیە لەگەڵ مسوڵمانان دا تووشی شەڕ بن، هەروەها پێشیان خۆش نیە لەگەڵ قەومە کافرەکەی خۆشیان دا شەڕ بکەن و، دەیانەوێ بێ لایەن بن، ئنجا دەفەرموێ:

﴿... وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ لَسَلَّطَهُمۡ عَلَيۡكُمۡ فَلَقَٰتَلُوكُمۡۚ فَإِنِ ٱعۡتَزَلُوكُمۡ فَلَمۡ يُقَٰتِلُوكُمۡ وَأَلۡقَوۡاْ إِلَيۡكُمُ ٱلسَّلَمَ فَمَا جَعَلَ ٱللَّهُ لَكُمۡ عَلَيۡهِمۡ سَبِيلٗا ﴿٩٠﴾﴾

واتە: وە ئەگەر خوا ویستبای: ئەوانی بەسەر ئێوەدا زاڵ دەکرد و دژتان دەجەنگین، بۆیە ئەگەر کەناریان گرت و جەنگیان دژی ئێوە نەکرد و، ئاشتییان بۆتان پێشاندا، (واتە: نیشانەی ئاشتییان لێوە دەرکەوت) ئەوە خوا هیچ ڕێگای جەنگکردنی نەداون لە دژی ئەوان، واتە: هیچ بواری تێدانیە و نابێ لە دژیان بن، با کافریش بن، مادام چاویان لە ئاشتیی و بێ لایەنییە.

لێرەدا خوا بە بێ ئەوەی کە باسی وەرگرتنی سەرانە بکات کۆمەڵێك کافرن، بەڵام دەیانەوێت بێ لایەن بن لە دەوڵەتی ئیسلامیدا باسی سەرانە وەرگرتن نەکراوە.

**٣- بەڵگەی سێیەم:**

بریتیە لە ڕێکەوتننامەی نێوان پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)و هۆزی (بني ضمرة) کە بێ لایەن بوون لە نێوان پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و هۆزی کافری قورەیش دا، کە ئەمە دەقی ڕێکەوتنامەکەیە، وەك (محمد حمیدالله) لە (مجموعة الوثائق السياسية في العصرِ النَّبَوي وَالخلافةِ الراشدة) دا، بە ژمارە (١٦٨) هێناویەتی: ( خَرَجَ رسولُ اللهِ **(صلی الله علیه وسلم)** لآتَنَتي

عَشَرةَ لَيلَةٍ قضَتْ من صَفَر في السَنَة الثانية للهجرَة، في سَبعينَ رَجُلاً ليسَ فيهم أنصاريٌّ، يَريدُ قُريشاً وَبني ضمرةَ، فاَتَّفَقَ له موادَعَةُ سِّيدِ بني ضَمرَةَ وهوَ مجديٌّ بنِ عمرو وَآستَقَرَّت المُصالَحَةُ على أن: لا يَغزوَ بني ضمَرَةَ، ولا يَغزوَنهُ، ولا يُكْثِرُوا عليهِ جمعاً، ولا يُعِينُوا عليه عَدوًّا )[1].

واتە: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) (دوازده) شەو تێپەڕی بوون لەمانگی صەفەری ساڵی دووەمی کۆچیی، لەگەڵ حەفتا پیاودا، کە هیچکام لە پشتیوانەکانیان لەگەڵدا نەبوون، [واتە: هەموویان کۆچکەر بوون] ڕۆیشت لە مەدینە دەرچوو، بەرەو ڕووی قورەیش [لە مەککە] وە هۆزی (بني ضمرة)، لەوێ لەگەڵ گەورەی هۆزەکەیان کە (مەجدی کوڕی عەمر) بوو ڕێککەوت و ڕێکەوتننامەکەیان لەسەر ئەوە کۆتایی هات، کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و مسوڵمانان دژی بەنی زەمرە جەنگ نەکەن و، ئەوانیش دژی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و مسوڵمانان جەنگ نەکەن، وە ئاپۆرایی و ڕەشایی هیچ کۆمەڵێکیش لە دژی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و مسوڵمانان زۆر نەکەن، وە هاوکاریی هیچ دوژمنێك نەکەن لە دژی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و مسوڵمانان، [واتە : بەبێ لایەنیی بمێننەوە].

لێرەش تەماشا دەکەین: هەرچەندە بەنو زەمرە ئامادە نەبوون ببنە هاوپەیمانی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) و مسوڵمانان، وە هیچ باسی سەرانە لەئارادا نیە و پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بەوەندە ئیکتیفای کردوە کە بێ لایەن بن.

**٤- بەڵگەی چوارەم:**

ڕێککەوتنی نێوان (عومەری کوڕی خەتتاب) خوای لێ ڕازی بێ و (العرب الجراجمة)یە، کە ( البلاذري) کتێبەکەی خۆی (فتوح البلدان)دا هێناویەتی: ( صالَحَ عُمَرُ العَرَبَ الجَراجِمةَ الجَبَليَّةَ الساكِنة على حدودِ سوريةَ، حينما فَتَحَ الشامَ على

---

(١) ص٢٦٧.

أن يكونُوا أعواناً للمسلمينَ و عيوناً ضَدَّ الرُّومِ، شريطَةَ أن لا يطلُبَ منهم الجِزيةَ)[١].

واتە: عومەر خوا لێی ڕازی بێت ( کە خەلیفەی مسوڵمانان بوو) لەگەڵ عەرەبی جەڕاجیمەی شاخاویی کە لەسەر سنووری سوریا دا نیشتەجێ بوون، ڕێککەوت، کاتێك کە شامیان ئازاد کرد، کە هاوکاریی مسوڵمانان بکەن، وە چاو بن بۆ مسوڵمانان لە دژی ڕۆم، [واتە: هەواڵیان بۆ بێنن و جاسووسییان بۆ بکەن، بە زاراوی ئەمڕۆ] بەڵام بەمەرجێك کە عومەر خوالێی ڕازی بێت سەرانەیان لێ داوا نەکات. واتە: عەرەبی جەڕاجیمەش لە ژێر سایە و ڕکێفی دەوڵەتی ئیسلامییدا بوون، بەڵام سەرانەیان لێ داوا نەکراوە.

کەواتە: بەم چوار بەڵگەیە زۆر بەڕوون و ڕاشکاویی دەزانین، کە مەرج نیە هەموو ئەو نامسوڵمانانەی کە لە دەوڵەتی ئیسلامیی دا دەژین، جا چ لە چوارچێوەی دەوڵەتەکەدا، چ لە دەرەوەی دەوڵەتەکەدا، بەڵام بەڵێن و پەیمانیان لەگەڵ دەوڵەتی ئیسلامییدا هەیە، مەرج نیە سەرانەیان لێوەربگیرێ، بەڵکو دەکرێ بێ لایەن بن، یان لەگەڵ دەوڵەتی ئیسلامیی دا هاوکاری یەکدی بن، بەڵام سەرانەیان لێ وەرنەگیرێ.

**سێیەم: ڕوونکردنەوەی سێیەم: مەرج نیە هەر ماڵ و سامانێك لەلایەن دەوڵەتی ئیسلامییەوە وەرگیرابێ لە ڕابردوودا، یان وەربگیرێ، لە نامسوڵمانانێك کە ملکەچبوون بۆ دەوڵەتی ئیسلامیی، یان ملکەچدەبن، بەسەرانە (جزیە) دانرابێت:**

دیارە کاتی خۆی عورف و باوی سیاسی ئەو ڕۆژگارە وابووە، واتە: سیاسەتی ئەوکاتە و هەڵوێستی دەوڵەتان و حوکمڕانان وابووە، کە دەوڵەتانی دەستڕۆیشتوو، ئەگەر توانیبیان ئەندازەیەك ماڵ و سامان و باجیان خستۆتە سەر ئەو قەوارە سیاسییانەی لەژێر ڕکێفیاندا بوون، کەدیارە ئێستاش هەر وایە، ئێستاش ئەمریکا و زلهێزەکانی دیکە، ئەگەر ڕاستەخۆش نەبێت بەناوونیشانی دیکە، بۆ وێنە: نەوتیان بە هەرزان لێوەردەگرن، قەرزیان پێ دەدەن، دوایی سوودی

---

(١) ص٢٠٩.

زۆری دەخەنە سەر، کە ئەوە ڕەمز و نیشانەی تەبایی و ئاشتیی بووە لەگەڵ ئەو دەوڵەتەدا، یان نیشانەی ملکەچیی و وابەستەیی ئەو قەوارە سیاسییانە بووە بۆ ئەو دەوڵەتە بەهێزە، ئیدی ئایا ئەوە چەندە شەرعیی بووە و، چەندە شەرعیی نەبووە؟! قسەمان لەوە نیە، قسەمان لەوەیە کە عورفی سیاسی ئەوکاتە وابووە، وە ئێستاش - وەك گوتم - ئەوە بە ناوونیشانی دیکەی جۆرا وجۆر هەر بەردەوامە، بەڵێ ئەو قەوارە سیاسییانە جاری وا بووە دەوڵەتی ئیسلامیی ئەندازەیەك باجی خستۆتە سەریان، یان ئەندازەیەك ماڵی لێوەرگرتوون، نەك وەك سەرانە، بەڵکو ئەندازەیەك ماڵ بووە و نیشانەی ئەوە بووە کە ئەو قەوارە سیاسییە، دژی دەوڵەتی ئیسلامیی نیە و بەرەنگاریی ناکات.

ئنجا ئەوە کە کراوە چ لە ڕۆژگاری خەلیفە ڕاشیدەکان دا، چ لە دواییشدا، دەبێ ئەوە بزانرێ کە هەمووی لەسەر بناغەی ئیجتیهاد بووە، هەڵبەتە ئەم بوارە هەمووی واتە: بواری چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو قەوارە سیاسییانەدا، کە لە سایەی دەوڵەت و کۆمەڵگای ئیسلامییدا دەژین، هەمووی بواری کۆشش کردنە و دەقی قورئان و سوننەت لەو بارەوە زۆر کەمن.

هەڵبەتە ئەم مەسەلەیە کێشە و مشتومڕی لەسەرە، بەڵام ئەوە ڕای منە کە کردوومە بە سەرباس و ناوونیشانی ئەم بەشی حەوتەمە، وە ڕای ژمارەیەك لە زانایانیشە، وە دوایی ڕوونی دەکەمەوە و ساغی دەکەمەوە کە بەڕاستیی ئەم ڕایە بەڵگەی بەهێزی هەیە، ئەگەرنا ئەم مەسەلەیە کە: ئایا هەموو نامسوڵمانێك بۆی هەیە ببێتە هاووڵاتیی لە ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامییدا، یان نا؟ ڕاجیایی لەسەرە و ڕاجیاییەکەش بەگشتی دەبێتەوە بە سێ ڕا و، زانایان لەو بارەوە سێ بەشن.

بەڵام بەرلەوەی ئەو سێ ڕایە بخەینەڕوو، پێویستە ڕاستییەك ڕوون بکەینەوە: زانایان کە باسی ئەوەیان کردوە: کێ بۆی هەیە لە دەوڵەتی ئیسلامییدا بژی و کێ بۆی نیە؟ واتە: کێ بۆی هەیە ببێتە هاووڵاتیی لە دەوڵەتی ئیسلامییدا، یان ببێتە هاوپەیمان لە نامسوڵمانان، وە کێ بۆی نیە؟! ئەم باسە یان لە ژێر ناوونیشانی: [الذين تقبل منهم الجزية] [ئەوانەی کە سەرانەیان لێ وەردەگیرێ]دا، داهێناوە، چونکە دەوڵەتی ئیسلامیی عادەتی وابووە هەرکەسێك لە نامسوڵمانان لەژێر سایەی دا ژیا بێت، سەرانەی لێوەرگیراوە، کە دیارە ئێمە پێشتر باسمان کرد، کە سەرانە تەنیا لە کەسانێك وەردەگیرێ (واتە: دروستە لە کەسانێك وەربگیرێ، نەك فەرز بێت) کە لەگەڵ دەوڵەتی ئیسلامییدا کەوتوونەتە حاڵەتی جەنگەوە، دوایی وازیان لە جەنگ هێناوە، دەوڵەتی ئیسلامیی بۆی هەبووە کە سەرانەیان لەسەر دابنێت، وەك ئایەتەکەی سووڕەتی (التوبة)، دەفەرموێ:

﴿ قَٰتِلُواْ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَلَا بِٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَلَا يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَلَا يَدِينُونَ دِينَ ٱلۡحَقِّ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ حَتَّىٰ يُعۡطُواْ ٱلۡجِزۡيَةَ عَن يَدٖ وَهُمۡ صَٰغِرُونَ ٢٩ ﴾

کەواتە: تەنیا ئەوانەی جەنگ لەدژی دەوڵەتی ئیسلامیی دەکەن، ئەوانە سەرانەیان لێوەرگیراوە و دروست بووە لێیان وەربگیرێ.

بەڵام ئایا بۆچی زانایان مەسەلەی: [کێ بۆی هەیە ببێتە هاووڵاتیی لە دەوڵەتی ئیسلامییدا؟] لەژێر ناوونیشانی: [سەرانە لەکێ وەردەگیرێ] دا، هێناویانە؟! چونکە ئەو کاتە عادەت وابووە هەرکەسێك چووبێتە ژێر ڕکێف و سایەی دەوڵەتی ئیسلامییەوە، سەرانەی داوە، بۆیە لەژێر ئەو ناوونیشانەدا هێناویانە، بەڵام پێشتر باسم کرد و ڕوونم کردەوە، کە ئەو کاتەش -واتە: لەسەردەمی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و خەلیفە ڕاشیدەکانیشی دا و دوایی ئەوانیش - مەرج نەبووە هەموو ئەوانەی کە هاووڵاتیی بوون لە ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامیی دا، وە هاوپەیمان بوون لەگەڵیدا، هەموویان سەرانەیان دابێت، بۆیە هێنانی ئەو بابەتە لە ژێر ئەو ناوونیشانەدا، بۆخۆم تێبینییم لەسەری هەیە و، دەبووایە هەر بەو ناوونیشانەی کە هێناومانە، کە بگوترێ: [کێ بۆی هەیە ببێتە هاووڵاتیی ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامیی دا]. هێنرابایە.

# خستنەڕووی سێ ڕایەكان

**ئێستاش بابێینە سەر خستنەڕووی سێ ڕایەكان:**

**ڕای یەكەم: دەڵێن: تەنیا خاوەن كتێبەكان، واتە: جوولەكەو نەصرانییەكان، وە مەجووسییەكان، بۆیان هەیە ببنە هاووڵاتیی لە دەوڵەتی ئیسلامییدا و تەنیا ئەوان سەرانەیان لێوەردەگیرێ:**

واتە: دروست نیە سەرانە لە غەیری ئەو دوو كۆمەڵە خەڵكە وەربگیرێ:

**یەكەم:** ئەهلی كیتاب ( كەمەبەست پێی جوولەكەو نەصرانییەكان بوون، هەرچەندە ئەهلی كیتاب تەنیا ئەوان نین ).

**دووەمیش:** مەجووسییەكان.

**ئەم ڕایەش هی:** (شافیعییەكان و حەنبەلییەكان و زاهیرییەكان و ئیبازییەكان و ئیمامییەكان)ە، وەك ( د. وهبة الزحیلي ) لە كتێبی ( آثار الحرب )[1] دا، لەوبترەوە ئاماژەی بەم سەرچاوانە كردوە:

١- ( الأم ) ی (إمام شافعي) ج٤ ص: ٩٧، ١٠٥، ١٥٨.

٢- ( نهایة المُحتاج، شرح المنهاج) ج٧ ص٢٢١.

٣- ( الروضة ) ج٢ص١٣٩.

٤- ( الحاوی ) ج١٩ ص٥٤.

---

(١) آثار الحرب، ص٦٩٧.

٥- ( الشرح الكبير ) ج١٠ ص٥٨٥.

٦- ( الإختيارات العلمية ) ص١٩٠.

٧- ( المحرَّر ) للرافعي، ج٢ص١٨٢.

٨- ( المحلّى)ى (ابن حزم ) ج٧ص٣٤٥.

٩- ( الشرحُ الرَضَوي ) ص٣٠٨.

١٠- ( شرح نيل الأوطار ) ج١٠ص٤٠٦.

١١- ( المختصرالنافع في فقه الإمامية ) ص١١٠.

١٢- ( أحكامُ أهل الذمة ) لابن قيم الجوزية ص١- ١٠.

هەڵبەتە لایەنگرانی ئەم ڕایە کە دەڵێن: سەرانە تەنیا لە ئەهلی کیتاب و لە مەجووسییەکان وەردەگیرێ، یانی: هەر ئەوانیش بۆیان هەیە ببنە هاووڵاتیی، چونکە ئەوکاتە مەرج بووە هەرکەسێك هاووڵاتیی بووایە لەدەوڵەتی ئیسلامییدا، دەبوایە سەرانە بدات.

**ڕای دووەم: دەڵێن: سەرانە لەهەموو کافرەکان وەردەگیرێ، جگە لە عەرەبە بت پەرستەکان، دیارە هەڵگەڕاوەکان ( المرتدون )یش بەڕای تێکڕای زانایان سەرانەیان لێوەرناگیرێ:**

ئەم ڕایەش هی حەنەفییەکان و زەیدییەکان و (أبو عبيد) و هەرکام لە (مالك و أحمد)ە لە یەکێك لە دوو ڕیوایەتەکەیان دا.

ئەمیش (د. وهبة الزُّحَيلي) لە کتێبی: (آثار الحرب )دا[1] لەبارەیەوە ئاماژەی بەم سەرچاوانە کردوە:

١- ( شرح السِّيَرْ الكبير) ج١ص١٠٢ و ج٤ ص١٤٦.

٢- ( المبسوط)ى(السرخسي) ج١٠ص٧.

---

(١) ص٦٩٨.

٣- ( الفتاوى الخيرية ) ج١ص١٠١.

٤- ( بدائع الصنائع ) ی (الكاساني) ج٧ ص١١٠.

٥- ( فتح القدير ) ج٤ص٣٧٠.

٦- ( البحرالزخّار) ج٥ص٢٩٦.

٧- (المُغني) لآبن قدامة، ج٨ص٣٧٠.

٨- ( المدونة الكبرى ) ج٣ص٤٦.

٩- ( الأموال ) لأبي عبيد، ص٣٠.

ئەمەش لایەنگرانی ڕای دووەم، کە دەڵێن: سەرانە لە هەموو کەس وەردەگیرێ، لەهەموو جۆرەکانی نامسوڵمانان، بێجگە لە بتپەرستە عەرەبەکان: (الوثنيون العرب)، هەروەها هەڵگەڕاوەکان (المرتدون)یش، واتە: هەموو کافرەکان بۆیان هەیە هاووڵاتیی بن لە دەوڵەتی ئیسلامییدا، بێجگە لە عەرەبە بتپەرستەکان و هەڵگەڕاوەکان.

**ڕای سێیەم: دەڵێن: سەرانە لە هەموو کافرێك وەردەگیرێ، عەرەب بێت، یان عەجەم، وەخاوەن کتێب بێت، یان بتپەرست جگە لە هەڵگەڕاوەکان:**

لەلای ئەمانیش دیسان هەڵگەڕاوەکان (المرتدون) هەڵدەوێردرێن و پێیان وایە بۆیان نیە لە دەوڵەتی ئیسلامییدا ببنە هاووڵاتیی، مەگەر تۆبە بکەن، ئەگەرنا دەبێ سزای هەڵگەڕانەوەیان بەسەردا بچەسپێنرێ، دواییش دەیخەمەڕوو، کە لەو بارەوە ڕام چییە!

**ئەم ڕایە کە دەڵێت:** هەموو کافرەکان بەهەموو جۆرەکانیانەوە بۆیان هەیە ببنە هاووڵاتیی لەدەوڵەتی ئیسلامییدا، بەواتایەکی دیکە: دروستە هەموو جۆرەکانی کافران سەرانەیان لێوەربگیرێ، کە پێشتر باسم کرد، مەرج نیە سەرانە لە هەموو کافرەکان وەربگیرێ، بەڵام بە هەرحاڵ لە ژێر ئەو ناوونیشانەدا هێناویانە.

**ئەم ڕایەش هی:** ( الأوزاعي والثورى و فقهاءُ الشام والمالكية على المشهور في مذهبهم )ە. وەك (د. وهبة الزحيلى ) لە كتێبی: ( آثار الحرب )[1]دا ئاماژەی بەم سەرچاوانە كردوە:

١- ( الحطاب و المواق ) ج٣ص٣٨٠.

٢- ( الخرَشِي ) ج٣ ص ١٦٦.

٣- ( مختص ابن حاجِب ) ص٤٦.

٤- ( إختلاف الفقهاء ) ص ٢٠١.

٥- (العيني شرحُ البخاري) ج٢٥ص٧٨.

٦- ( شرحُ صحيح مسلم ) ج١٢ص ٣٩.

هەڵبەتە من ڕای سێیەمم پێ ڕاستە، بەڵام دیارە بە تێبینییەكەوە كە دوایی دەیخەمە ڕوو، بەڵام بەچاكی دەزانم پێش ئەوەی كە بەڵگەكانی ڕای سێیەم، كە من پێم وایە ئەوە ڕایەكی ڕاستە، بخەمە ڕوو، بەڵگەكانی ڕای یەكەم و دووەم بخەمە ڕوو، دیارە دوایی لەكاتی خستنە ڕووی بەڵگەكانی ڕای سێیەم دا، هەڵسەنگاندنێكی كورتیش دەكەین، بۆ بەڵگەكانی ڕای یەكەم و دووەم، وە دەری دەخەین كە بەڵگەكانیان ئیسپاتی ئەو دەعوایەی ئەوانیان پێ ناكرێت.



---

(١) ص٦٩٩.

**بەڵگەکانی ڕای یەکەم: کە دەڵێ: سەرانە تەنیا لە خاوەن کتێبەکان و لەمەجووسییەکان وەردەگیرێ:**

ئەمانە بەگشتی سێ بەڵگە دێننەوە:

**بەڵگەی یەکەم:** ئایەتەکەی سوورەتی (التوبة)یە، کە دەفەرموێ:

﴿ قَٰتِلُواْ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَلَا بِٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَلَا يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَلَا يَدِينُونَ دِينَ ٱلۡحَقِّ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ حَتَّىٰ يُعۡطُواْ ٱلۡجِزۡيَةَ عَن يَدٖ وَهُمۡ صَٰغِرُونَ ٢٩ ﴾

دەڵێن: لێرەدا خوای دادگەر تەنیا باسی ئەهلی کیتاب دەکات، کەواتە: سەرانە تەنیا لەوان وەردەگیرێ، چونکە خوا دەربارەی هاوبەش دانەرەکان و بتپەرستەکان دەفەرموێ:

﴿... فَٱقۡتُلُواْ ٱلۡمُشۡرِكِينَ حَيۡثُ وَجَدتُّمُوهُمۡ... ﴾ التوبة -٥-.

واتە : هاوبەش بۆخوادانەرەکان بکوژن لە هەر شوێنێك بەرپەلتان کەوتن، کەواتە: نابێ سەرانەیان لێوەربگیرێ.

**بەڵگەی دووەم:** ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەری خوایە (صلى الله عليه وسلم) کە دەفەرموێ:

{أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَقُولُوا لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ فَإِذَا قَالُوهَا عَصَمُوا مِنِّى دِمَاءَهُمْ وَأَمْوَالَهُمْ إِلاَّ بِحَقِّهَا وَحِسَابُهُمْ عَلَى اللَّهِ} (رَوَاهُ البُخَارِيُّ برقم: (٢٥)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٢) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا).

واتە: فەرمانم پێ کراوە کەلەدژی خەڵك بجەنگم، هەتا دەڵێن: بێجگە لە خوا هیچ پەرستراوێك نیە، ئنجا ئەگەر گوتیان، ئەوە خوێن و ماڵ و سامانی خۆیان، لەمن پاراستوە، مەگەر بە هەقی خۆی.

دەڵێن: کەواتە: تەنیا خاوەن کتێبەکان سەرانەیان لێوەردەگیرێ و، بەهاووڵاتیی دەوڵەتی ئیسلامیی قبووڵ دەکرێن.

**بەڵگەی سێیەم:** بە نسبەت مەجووسییە ئاگر پەرستەکانەوە، ئەم چەند فەرموودەیە هەن، لەو بارەوە کە مەجووسییەکان لەباقی کافرەکان جیادەکرێنەوە، واتە: ئایەتەکە کە دەفەرموێ: سەرانە تەنیا لە ئەهلی کیتاب وەردەگیرێ، پاشان ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)دەفەرموێ: فەرمانم پێ کراوە کە لەدژی خەڵك بجەنگم، تاکو شایەتمان دێنن، بەڵام ئایەتەکە چەمك و واتای ئەم فەرموودەیە تایبەت دەکات بە غەیری ئەهلی کیتابەوە، ئنجا هەندێك فەرموودەی دیکەشمان هەن کە مەجووسییەکان هەڵداوێرن لە باقی کافرەکان و، هەرچەندە خاوەن کتێبیش نین، بەڵام وەك ئەهلی کیتاب مامەڵەیان لەگەڵ دا دەکرێ.

١- یەکێك لە فەرمایشتەکان: {أَنْ عُمَرُ لم يَأْخُذَ الْجِزْيَةَ مِنْ الْمَجُوسِ حَتَّى شَهِدَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَخَذَهَا مِنْ مَجُوسِ هَجَرَ} (رَوَاهُ ابْنُ أَبِي شَيْبَة برقم: (٣٣٣١٦)، وَأَحْمَد برقم: (١٦٨٥)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٣١٥٧)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١٥٨٧)).

واتە: (عومەر) خوالێی ڕازی بێ - خەلیفەی دووەمی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) - ئامادەنەبوو سەرانە لە مەجووسییەکان وەربگرێ، تاکو عبدالرحمن ی کوڕی عەوف شایەدیی دا کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە مەجووسییەکانی هەجەر (ناوی هۆزێکە، یان ناوچەیەکە) سەرانەی وەرگرتوە، ئنجا عومەر خوالێی ڕازی بێت ئامادەبوو کە سەرانە لەمەجووسییەکان وەربگرێ.

٢- {قَالَ مُغيرَةُ بْن شُعْبَة لِعَامِلِ كِسْرَى بَيْنَ يَدي مَعْرَكَةِ نَهَاوَند: فَأَمَرَنَا نَبِيُّنَا رَسُولُ رَبِّنَا أَنْ نَقَاتِلَكُمْ حَتَّى تَعْبُدُوا اللَّهَ وَحْدَهُ أَوْ تُؤَدُّوا الْجِزْيَةَ } (رَوَاهُ البُخَارِيُّ برقم: (٣١٥٩)).

واتە: موغەیرەی کوڕی شوعبە بەعامیلی کیسرای گوت [کەسێك بووە سەرپەرشیاری ناوچەیەکی کردوە لەلایەن کیسراوە] لە پێش جەنگی نەهاوەند: پێغەمبەرەکەمان ڕەوانەکراوی پەروەردگارمان، فەرمانی پێ کردووین کەلە دژتان بجەنگین، تاکو تەنیا خوا دەپەرستن، یاخود سەرانە دەدەن.

کەواتە: ئەو سەرانەدانە بۆ مەجووسییەکانیش بووە.

٣- فەرموودەیەکی دیکە لەو بارەوە: {رَوَى مَالِك وَالبَيْهَقِي وَالشَّافِعِيُّ أَنَّ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ رَضِيّ اللهُ عَنْهُ: أَشْهَدُ لَسَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: "سُنُّوا بِهِمْ سُنَّةَ أَهْلِ الْكِتَابِ"} (رَوَاهُ مَالِك «المُوطأ» برقم: (٦٢١)، والبيهقي في الكبرى برقم: (١٣٧٦٤)، والشافعي في المسند برقم: (١٠٠٨)).

(عبدالرحمن کوڕی عەوف) گوتوویەتی: شایەدیی دەدەم کە لە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)م بیست فەرمووی: لەگەڵ مەجووسییەکان دا وەك خاوەن کتێبەکان مامەڵە بکەن.

واتە: سەرانەیان لێوەربگرن، دیارە لە شوێنەواری دیکە دا هاتوە: بەڵام ئافرەتیان لێ مەهێنن و سەربڕاویان مەخۆن، هەرچەندە لەو بارەشەوە لە نێوان زانایان دا مشتومڕ هەیە.

کەواتە: بەپێی ئەم بەڵگانە: تەنیا خاوەن کتێبەکان و مەجووسییە ئاگر پەرستەکان، سەرانەیان لێوەردەگیرێ، ئەمە بەڵگەکانی ڕای یەکەم.

**بەڵگەکانی ڕای دووەم: کە دەڵێ: سەرانە لە هەموو نامسوڵمانان وەردەگیرێ، جگە لە عەرەبە بتپەرستەکان:**

ئنجا بابێینە سەر خستنە ڕووی بەڵگەکانی ڕای دووەم، کە دەڵێ: بێجگە لە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانی نەتەوەی عەرەب، سەرانە لەهەموو جۆرەکانی دیکەی کافران وەردەگیرێ.

**لایەنگرانی ئەم ڕایەش ئەم بەڵگانە دێننەوە:**

**بەڵگەی یەکەم:** سەرانە لە خاوەن کتێبەکان وەردەگیرێ، وەك لایەنگرانی ڕای یەکەم گوتیان و بەڵگەیان هێنانەوە.

**بەڵگەی دووەم:** بۆ سەلماندنی ئەوەش کە سەرانە لە بتپەرستەکان وەردەگیرێ، جگە لە بتپەرستە عەرەبەکان، ئەم فەرموودەیە دێننەوە:

{عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ بُرَيْدَةَ عَنْ أَبِيهِ قَالَ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا أَمَّرَ رَجُلًا عَلَى سَرِيَّةٍ أَوْصَاهُ إِذَا لَقِيتَ عَدُوَّكَ مِنْ الْمُشْرِكِينَ فَادْعُهُمْ إِلَى إِحْدَى ثَلَاثِ خِلَالٍ أَوْ خِصَالٍ فَأَيَّتُهُمْ مَا أَجَابُوكَ إِلَيْهَا فَاقْبَلْ مِنْهُمْ وَكُفَّ عَنْهُمْ ثُمَّ ادْعُهُمْ إِلَى الْإِسْلَامِ فَإِنْ هُمْ أَجَابُوكَ فَاقْبَلْ مِنْهُمْ وَكُفَّ عَنْهُمْ ثُمَّ ادْعُهُمْ إِلَى الإسلام، فَإِنْ هُمْ أَبَوْا فَأَخْبِرْهُمْ أَنَّهُمْ يَكُونُونَ كَأَعْرَابِ الْمُسْلِمِينَ يَجْرِي عَلَيْهِمْ حُكْمُ اللَّهِ الَّذِي يَجْرِي عَلَى الْمُؤْمِنِينَ وَلَيْسَ لَهُمْ فِي الْفَيْءِ وَالْغَنِيمَةِ نَصِيبٌ إِلَّا أَنْ يُجَاهِدُوا مَعَ الْمُسْلِمِينَ فَإِنْ هُمْ أَبَوْا أَنْ يَدْخُلُوا فِي الْإِسْلَامِ فَسَلْهُمْ إِعْطَاءَ الْجِزْيَةِ فَإِنْ فَعَلُوا فَاقْبَلْ مِنْهُمْ وَكُفَّ عَنْهُمْ فَإِنْ هُمْ أَبَوْا فَاسْتَعِنْ بِاللَّهِ وَقَاتِلْهُمْ }(رَوَاهُ مُسْلِمٌ برقم: (١٧٣١)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١٦١٧)، وَأَبُودَاوُدَ برقم: (٢٦١٢).

واتە: (بُريدة) لە بابیەوە دەگێڕێتەوە دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کە فەرماندەیەکی دادەنا بۆ کۆمەڵێکی جەنگاوەر، ئامۆژگاریی دەکرد دەربارەی خۆی، کە پارێزکار بێت، وە دەربارەی مسوڵمانانێکیش کە لەگەڵیدا

بوون، کە لەگەڵیان چاك بێ، دوایی دەیفەرموو: وەهەرکاتێك بە دوژمنەکەت لە هاوبەشدانەرەکان گەیشتی، بۆ یەکێك لەسێ شتان بانگیان بکە، ئنجا هەرکامێك لەو سێیانەیان قبوول کرد، لێیان وەربگرە و وازیان لێبێنە:

١- بانگیان بکە بۆ ئیسلام، [واتە: مسوڵمان بن].

٢- ئنجا ئەگەر ڕازی بوون، باشە، بەڵام ئەگەر ڕازی نەبوون مسوڵمان بن، ئەوە سەرانەیان لێ داوا بکە.

٣- ئنجا ئەگەر وەڵامیان دایەوە، لێیان وەربگرە و وازیان لێ بێنە، بەڵام ئەگەر ئامادەنەبوون سەرانە بدەن، پەنا و یارمەتی لە خوا وەربگرە و، لەدژیان بجەنگە.
لێرەدا کە فەرموویەتی: (لقيت عدوك من المشركين) یانی: ئەگەر بە دوژمنەکەت گەیشتی لە هاوبەش بۆ خوادانەرەکان، کەواتە: هەموو هاوبەش بۆخوادانەرەکانیش سەرانەیان لێوەردەگیرێ، بەڵام ئایا بەڵگە چییە لەسەر ئەوە کە سەرانە لە عەرەبە هاوبەش بۆ خوادانەرەکان وەرناگیرێ؟! ئەم بەڵگەیان هێناوەتەوە:

( عَن يونسِ بن يزيدِ الأَبْلِي قال: سألتُ ابن شِهابٍ: هَل قبِلَ رسولُ اللهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) من أحَدٍ من أهلِ الأوثانِ من العَرَب الجزيةَ؟ فقالَ: مضَتِ السُنَّةُ أن يَقبَلَ مِمَّن كانَ من أهلِ الكتابِ من اليهودِ والنصارى من العَرَبِ الجِزيةَ، وذالِكَ لأَنهم منهُم وإِليهِم... قالَ أبو عبيد: فعَلَى هذا تتابعت الآثار عن رسولِ اللهِ و الخلفاءِ بعدُ في العربِ من أهلِ الشِّركِ، أن من كانَ منهم ليسَ من أهلِ الكتابِ فإنهُ لايُقبَلُ منهُ الا الإِسلامُ أو القتلُ، كما قالَ الحسن، وأما العَجَم فَتُقبَلُ منهُم الجِزيةُ، وإِنْ لم يكونُوا أهلَ كِتابٍ، للسّنَّةِ التي جاءَت عن رسولِ اللهِ في المجوسِ وليسَوا بأهلِ كتابٍ وقُبِلَت بعدَهُ من الصابئين)[1].

واتە: یونسی کوڕی یەزید دەگێڕێتەوە دەڵێ: لە (ابن شهاب)م پرسی: ئایا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) سەرانەی لەهیچ کام لە بتپەرستەکانی عەرەب وەرگرتوە؟ گوتی: سوننەتی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)

---

(١) الأموال لأبي عُبَيد، ص٢٦-٣٠.

وابووە، کە ئەو عەرەبانەی ئەهلی کیتاب بوون لە جوولەکە و نەصرانییەکان، سەرانەی لێوەرگرتوون، چونکە ئەوانەش با عەرەبیش بووبن، بەڵام مادام ئەهلی کیتاب بن، هەر لەوانن و بۆ وان دەگەڕێنەوە، ئەبو عوبەید دەڵێت: بەم شێوەیە شوێنەوارەکان لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بەردەوام هاتوون، وە لە خەلیفە ڕاشیدەکانیشەوە، کە عەرەبە هاوبەش بۆخوا دانەرەکان و ئەوانەی خاوەن کتێب نەبوون، لێیان قبووڵ نەکراوە، یان دەبوو مسوڵمان بن، یان دەبوو جەنگیان لەدژ بکرێ، (حەسەنی بەصرایی) وای گوتوە، بەڵام عەجەم [واتە: بتپەرستەکانی غەیری عەرەب] سەرانەیان لێوەرگیراوە، با خاوەن کتێبیش نەبووبن، چونکە لە سوننەتی پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم) هاتوە، کە سەرانەی لە مەجووسییەکان وەرگرتوە، هەرچەندە مەجووسییەکان خاوەن کتێبیش نەبوون، هەروەها لە دوای ئەوان سەرانە لە صابیئەش وەرگیراوە.

**بەڵگەکانی ڕای سێیەم: کە دەڵێ: سەرانە لە سەرجەم نامسوڵمانان وەردەگیرێ، جگە لە هەڵگەڕاوەکان:**

ئێستاش دێینە سەر خستنە ڕووی بەڵگەکانی ڕای سێیەم، کە بەلای ئێمەوە تاکە ڕای ڕاست و پەسەندە، کە: تێکڕای مرۆڤەکان بێجگە لە هەڵگەڕاوەکان، ( بەڵام بە ڕای من کە دوایی ڕای خۆم دەخەمە ڕوو) ئەوانیش بۆیان هەیە لە سایەی دەوڵەتی ئیسلامییدا بژین.

دیارە لایەنگرانی ئەم ڕایەی سێیەم: کە دەڵێت: سەرجەم جۆرەکانی کافران بۆیان هەیە لە دەوڵەتی ئیسلامییدا بژین، وەك گوتم: زانایان لە ژێر ئەم ناوونیشانەدا هێناویانە: [ئەوانەی دروستە سەرانەیان لێوەربگیرێ] ئەو زانایانەش بریتین لە: (الأوزاعي، الثوري، فقهاء الشام، والمالكية) لە قسەی باوی مەزهەبەکەیان دا - کە پێشتریش باسمان کرد- وە بێجگە لەوانیش هەرکام لە (ابن القيم) و (الشوكاني) و (الصَّنعاني) لە نێویان دا هەن، دیارە لە زانایانی هاوچەرخیش ژمارەیەکی زۆریان.

ئنجا بۆیەش من پێم وایە ئەم ڕایەی سێیەم، تاکە ڕای گونجاوە لەگەڵ دەقەکانی قورئان و سوننەت دا، چونکە ناگونجێ دەوڵەتێکی ئیسلامیی و کۆمەڵگایەکی ئیسلامیی، کە کۆتا بەرنامەی خوای پەروەردگار تەبەنیی دەکات و، دەیکاتە ڕێبازی ژیانی، سەغڵەت بێت بە حەواندنەوەی هیچ کام لە مرۆڤەکان، خاوەنی هەر فیکرە و دینێك و بۆچوونێك بن.

**شایانی باسیشە کە بەڵگەکانی ئەم ڕای سێییەمە، دوو بەڵگەی سەرەکیین:**

**بەڵگەی یەکەم:** ئەو فەرموودەیە کە (سليمان بن بريدة عن أبيهِ) کە پێشتر هێنامان گێڕاویەتەوە، کە تێیدا هاتوە: (اذا لقيتَ عدوَّكَ من المشركين) ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە دروستە سەرانە لە تێکڕای کافرانی شەڕکەر لەگەڵ سوپای ئیسلام دا، وەربگیرێ، هەڵبەتە فەرز نیە، بەڵام دروستە وەربگیرێ، چونکە ڕستەی: (اذا لقيتَ عدوَّكَ من المشركين)) وشەی: (عدوك) دوژمنەکەت

(من المشركين) لە هاوبەش بۆ خوا دانەران، هەموو جۆرەکانی کافران دەگرێتەوە، چونکە بێگومان هەرکەسێك خوا نەپەرستێ، دیارە غەیری خوا دەپەرستێ، وە ئەهلی کیتابیش ئەوە دیارە، بە پێی ئایەتەکەی ژمارە (٢٩)ی (التوبة)، کەواتە: ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە سەرانە لە تێکڕای کافران وەردەگیرێ، چونکە ئەو کاتە کافرانی جەنگاوەر لە دژی ئیسلام، یان خاوەن کتێب بوون، یاخود هاوبەش بۆ خوا دانەربوون و، (عدوّك)ش گشتگیر (شامل)ە بۆ هەردووکیان.

ئێستاش باسەرنجی قسەی هەندێك لەزانایان بدەین، لەبارەی ئەو فەرموودەیە و چۆنیەتی دەلالەت کردنی لەسەر ئەوە سەرجەم نامسوڵمانان بۆیان هەیە ببنە هاووڵاتیی لەدەوڵەتی ئیسلامیی دا و، لە کاتی پێویست دا دروستە سەرانەیان لێوەربگیرێ:

١- (**النّووي**) لە کاتی شەرحی ئەم فەرموودەیەدا، لە کتێبەکەی خۆی: ( شرح صحيح مسلم )دا گوتوویەتی: ( هذا مما آستدلَّ بِهِ مالِكٌ والأوزاعيُّ وموافقوهما في أَخْذِ الجِزيةِ من كُلِّ كافرٍ عرَبياً كانَ أو أعجَمياً، كِتابياً أو مجوسياً، أو غَيرَهُما)[1].

واتە: ئەم فەرمایشتە مالیك و ئەوزاعیی و ئەوانەی ڕایان وەك ئەوانە، بەبەڵگەیان هێناوەتەوە، لەسەر ئەوە کە سەرانە لە هەموو کافرێك وەردەگیرێ (واتە: هەموو کافرێکی شەڕکەر لە دژی ئیسلام) عەرەب بێ، یان غەیری عەرەب، خاوەن کتێب بێ یان نا، وە مەجووسیی بێ، یاخود غەیری خاوەن کتێب و مەجووسیی.

٢- (**الصَّنعانـي**) لە شەرحی هەمان فەرموودەدا، لە کتێبی: (سُبُل السَّلام)دا گوتوویەتی: ( في الحديثِ دليلٌ على أن الجِزيةَ تُؤْخَذُ من كُلِ كافِرٍ، كِتابيٍ او غيرِ كِتابيٍ، عَرَبيٍ أو غيرِ عَرَبيٍ، لقَولِه (عَدوكَ) وهوَ عامٌ)[2].

---

(١) ج٧ ص١١٣.
(٢) ج٤ص٤٧.

واتە: لەم فەرمایشتەدا بەڵگە هەیە لەسەر ئەوە کە سەرانە لە هەموو کافرێك وەردەگیرێ، خاوەن کتێب بێت یان نا، عەرەب بێ، یاخود غەیری عەرەب، چونکە وشەکەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)کە دەفەرموێ: (عدوك) دوژمنەکەت، وشەیەکی گشتییە.

کەواتە: هەرکەسێك دژی ئەهلی ئیسلام بێ، دوای ئەوەی واز لە دژایەتیی و جەنگ کردن لەبەرانبەر ئیسلام دا دێنێ، دروستە سەرانەی لێ وەربگیرێ، ئەگەر دەوڵەتی ئیسلامیی بۆی گونجا، یان وای بەباش زانی، کە جاری واش هەیە بۆی نالوێ، یان وای بەباش نازانێ، وەك پێشتر باسمان کرد.

٣- (**الشوكاني**)یش هەر لەو بارەوە، لە شەرحی ئەم فەرمایشتەدا، لە کتێبی: (نيل الأوطار)دا گوتوویەتی: ( قَولُهُ: (فَسَلْهُم الجزيَةَ) ظاهِرُهُ عدمُ الفرقِ بين الكافِرِ العَجَميِّ والعربيِّ والكتابيِّ وغيرِ الكتابيِّ)[1].

واتە: ئەوە کە دەفەرموێ: سەرانەیان لێ داوا بکە، ڕواڵەتەکەی ئەوە دەگەیەنێ کە جیاوازیی ناکرێ لە نێوان کافری غەیری عەرەب و عەرەب، وە کیتابیی و غەیری کیتابیی، هەموویان وەك یەك سەرانەیان لێوە ردەگیرێ، [لە کاتێك دا کە سەنگەر لە ئەهلی ئیسلام دەگرن، دروستە سەرانەیان لێوەربگیرێ، وەك صوڵح لەگەڵدا کردنیان].

٤- هەروەها هەر (**الشوكاني**) لە کتێبێکی دیکەی خۆی دا بە ناوی: (السَّيل الجَرَّار) گوتوویەتی: ( ظاهِرُ الأدِلّةِ يقتضى أَنَّ بذْلَ الجِزيةِ من أيِ كافر يوجبُ الكَفَّ عن مقاتَلَتِه، فإنَّ قولَهُ: (كان رسولُ اللهِ اذا أَمَّرَ أميراً على جيشٍ أو سَريَّةٍ) يدُلُّ على أن هذا كانَ شأنُه في كُلِّ جَيشٍ يبعَثُهُ)[2].

واتە: ڕواڵەتی بەڵگەکان ئەوە دەخوازێ کە سەرانەدان لە هەرکافرێکەوە بێ، ئەوە دەخوازێ کە واز جەنگ لە دژ کردنی بهێندرێ و شەڕی لەگەڵ دا نەکرێ،

---

(١) نيل الأوطار، ج٧، ص٤٥.

(٢) ج٤ ص٥٧٠، ٥٧١.

چونکە فەرموودەکەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) کە دەفەرموێ:

(كان رسولُ اللهِ اذا أَمَّرَ أميراً على جيشٍ أو سَريّةٍ...).

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) کە فەرماندەیەکی بۆ سوپایەك، یان سەرییەیەك دادەنا، ئەوە دەگەیەنێ کە ئەوە عادەتی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بووە، هەرکاتێك کە لەشکرێکی ناردبێ هەر بەو شێوەیەی پێ فەرموون، [کە بانگیان بکەن بۆ ئیسلام، ئەگەر مسوڵمان بوون باشە، بەڵام ئەگەر مسوڵمان نەبوون، پێیان بڵێن: سەرانە بدەن، ئەگەر سەرانەشیان نەدا، ئەوە مانای وایە نەدێنە نێو ئیسلامەوە و نە لەگەڵ دەوڵەتی ئیسلامیشدا ئامادەن کە حاڵەتی ئاشتیی و صوڵح و تەبایی بنوێنن، مانای وایە دەبێ جەنگیان لەگەڵ دا بکرێ، چونکە خۆیان ئیعلانی جەنگیان کردوە].

**بەڵگەی دووەم:** زانایان یەکدەنگن لەسەر ئەوە کە دروستە سەرانە لە مەجووسییەکان وەربگیرێ، وە ئەوە چەندان فەرموودەی صەحیحی لەسەرن، وەك پێشتر ئاماژەمان پێدان.

ئنجا ساغیش نەبۆتەوە کە مەجووسییەکان خاوەن کتێب بووبن، کەواتە: سەرانە لە هەموو کافران وەردەگیرێ، بەبێ جیاوازیی لە نێوانی عەرەب و غەیری عەرەب دا، بەڵکو ئەوە کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ:

( سُنُّوا بهم سُنَّةَ أهلِ الكتاب)[1].

وەك خاوەن کتێبەکان مامەڵەیان لەگەڵ دا بکەن، ئەمە ئەوەی لێوەردەگیرێ کە ئەوان خاوەن کتێب نین، ئنجا ئایا بۆچی ئاگر پەرست سەرانەی لێوەردەگیرێ، بەڵام بتپەرست لێی وەرناگیرێ؟! بۆچی خاچ پەرستان و ئاگر پەرستان (عُبَّاد الصُّلبْان وعُبّادالنِّيران) سەرانەیان لێوەر بگیرێ، بەڵام بت پەرستان (عُبّاد الأوثان) لێیان وەرنەگیرێ، لەحاڵێك دا کە هیچ جیاوازییەکیان لە نێوان دا نیە، چونکە هەموویان غەیری خوا دەپەرستن؟!

---

(١) رواه مالك في (الموطأ) والبيهقي في (السنن).

**سێ ئیشكال لەلایەن لایەنگرانی ڕای یەكەم و دووەمەوە، وەڵامدانەوەیان لەلایەن لایەنگرانی ڕای سێیەمەوە:**

**ئیشكالی یەكەم:** دەڵێن: بەپێی ئایەتی:

﴿ قَٰتِلُواْ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَلَا بِٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَلَا يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَلَا يَدِينُونَ دِينَ ٱلۡحَقِّ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ حَتَّىٰ يُعۡطُواْ ٱلۡجِزۡيَةَ عَن يَدٖ وَهُمۡ صَٰغِرُونَ ٢٩ ﴾ التوبة -٢٩-.

خوا ڕێگای داوە كەسەرانە لە خاوەن كتێبەكان وەربگیرێ، وە لە سوننەتیشدا چەسپاوە كە مەجووسییش لێیان وەردەگیرێ، بەڵام لە قورئان و سوننەت دا نیە، كە جگە لەوان سەرانەیان لێوەربگیرێ!

**وەڵام:** بەڵگە هێنانەوە بە چەمكی پێچەوانەیی (مفهوم المخالفة)ی كە لە ئایەتی (٢٩)ی سوورەتی (التوبة) وەردەگیرێ، پشتی بە ( مفهوم الصفة ) بەستوە، چونكە (مفهوم المخالفة ) چەند جۆرێكی هەیە، كە یەكێكیان ( مفهوم الصفة )یە، واتە: سیفەتێك كە باسكراوە، هەركاتێك ئەو شتەی باس دەكرێ، سیفەتەكەی پێچەوانەی ئەو سیفەتە بوو، ئەوە چەمكەكەی پێچەوانە دەبێتەوە، واتە: بەپێی ئایەتەكە، ئەوەی خاوەن كتێب نەبێ، نابێ سەرانەی لێوەربگیرێ، چونكە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿...ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ حَتَّىٰ يُعۡطُواْ ٱلۡجِزۡيَةَ ... ﴾ ئەوانەی كە كتێبیان پێدراوە. دەڵێین: لە ڕاستییدا بەڵگەهێنانەوە بە (مفهوم المخالفة) كە بەستراوە تەوە بە (مفهوم الصفة )وە، لە ئایەتی جیزیەدا، ڕاست نیە، بەبەڵگەی ئەوە كە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەربارەی مەجووس، فەرموویەتی: (سُنُّوبهم سُنَّةَ أهلِ الكتاب) مامەڵە لەگەڵ مەجووسییەكان دا بكەن، وەك لەگەڵ ئەهلی كیتاب دا دەیكەن، كەواتە: ئەو چەمكی پێچەوانەیی ( مفهوم المخالفة )یە، ئیشی پێ ناكرێ، كە پەیوەستە بە صیفەتەوە و، ئەگەر ئیشی پێ كرابایە، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) نەیدەفەرموو: لەگەڵ مەجووسییەكان دا، وەك خاوەن كتێبەكان مامەڵە بكەن.

(**الصنعاني**) لەو بارەوە گوتوویەتی: (أما الآية فأفادت أَخْذَ الجزيةِ من أهلِ الكتاب ولم تتعَرَّض لأَخذِها من غيرهم ولا لعدمِ أَخْذِها، والحديثُ - يعني حديث بريدة - يُبَيِّنُ أَخْذَهَا من غيرهم)[1] بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەو ئیشکالە دەڵێت: ئایەتەکە ئەوە دەگەیەنێت کە دروستە سەرانە لەخاوەن کتێبەکان وەربگیرێ، بەڵام باسی ئەوەی نەکردوە، کە لە غەیری خاوەن کتێبەکان وەربگیرێ یان نا؟ بەڵام فەرموودەکەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) کە بورەیدە لە باببیەوە هێناویەتی، ڕوونی دەکاتەوە کە سەرانە لە غەیری خاوەن کتێبەکانیش وەردەگیرێ.

کەواتە: ئەو چەمکی پێچەوانەیی (مفهوم المخالفة )یە کە لە ئایەتەکەدا هەیە، ئیشی پێناکرێ، لەبەرئەوەی پەیوەستە بە (صِفة)ەوە و، لەبەرئەوەو فەرموودەیەی پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم).

**ئیشکالی دووەم:** دەڵێن: وەرنەگیرانی سەرانە لە عەرەبە بپتەرستەکان، بەڵگەیە لەسەر دروستنەبوونی وەرگیرانی لە عەرەبە بتپەرستەکان، واتە: کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) سەرانەی لە عەرەبە بتپەرستەکان وەرنەگرتوە و، لە سیرەدا نەهاتوە کە سەرانەی وەرگرتبێ، ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە سەرانەیان لێ وەرناگیرێ.

وەڵامی ئەم ئیشکالەش (**ابن القيمِّ**) لە کتێبی: (زادالمعاد في هَدْي خير العباد) دا زۆر جوان ڕوونی کردۆتەوە و گوتوویەتی: ( وقال طائفةُ في الأُمَمِ كُلِهَّا، إذا بَذلوا الجِزيةَ قُبِلَت منهم، أهل الكتابَيْن بالقرآن، والمجوسُ بالسُنَّةِ، ومَنْ عداهُم مُلحَقٌ بهم، لأنَّ المجوسَ أهلُ شِركٍ لا كتابَ لهُم، فأَخْذُها منهم دليلٌ على أخذها من جميع المشركين، وإنَّما لم يأخذْها (صلى الله عليه وسلم) من عَبَدةِ الأَوثانِ من العَرَب، لأنهم أَسْلَموا كُلُّهم قبل نزول آيةِ الجزيةِ، فإنّها نَزَلَت بعد تبوك وكان رسولُ اللهِ (صلى الله عليه وسلم) فَرَغ من قِتال العَرَبِ، واستوثقت كُلُّها لهُ بالإسلام، ولهذا لم يأخذْها من اليهودِ الذينَ حاربوهُ، لأنَّها لم تكن نَزَلَت بَعدُ، فَلَما نَزَلَت أَخَذَها من نصارى العَرَبِ ومن المجوسِ،

---

(١) سبل السلام، ج٤ص٤٧.

ولو بَقِيَ حينئذٍ أحَدٌ من عَبَدةٍ الأوثانِ، بَذَلَها، لَقَبِلَها منهُ، كما قَبِلَها من عَبَدِة الصُّلبْانِ والنِّيرانِ، وهذا القولُ أَصَحُّ في الدليلِ كما ترى)[1]، واتە: وە كۆمەڵێك گوتوویانە: هەموو كۆمەڵانی كافرەكان ئەگەر سەرانەیاندا، لێیان وەرەگیرێ، هی خاوەن دوو كتێبەكان ( واتە خاوەنی تەورات و ئینجیل، جوولەكە و نەصرانییەكان) بەدەقی قورئان، هی مەجووسییەكانیش بەدەقی سوننەت، وە غەیری خاوەن كتێبەكان و مەجووسییەكانیش، بەوانەوە پەیوەست دەكرێن و، قیاس دەكرێنە سەر ئەوان، چونكە مەجووسییەكان ئەهلی شیرك بوون، [واتە: هاوبەش بۆخوا دانەربوون]، وە خاوەن كتێب نە بوون، كەواتە: وەرگرتنی سەرانە لە مەجووسییەكان، بەڵگەیە لەسەر ئەوە كە لە هەموو هاوبەش بۆخوادانەرەكان و كافرەكان وەردەگیرێ، وە بۆیەش پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) سەرانەی لە بتپەرستەكان وەرنەگرتوە (بتپەرستەكانی عەرەب) چونكە پێش ئەوەی ئایەتی جیزیە بێتە خوار، هەموویان مسوڵمان بووبوون، [ئنجا ئەوەی بە ڕاست مسوڵمان بووبێ، یان هەر بەڕواڵەت و مونافیق بووبێ] هەر بۆیەش پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) سەرانەی لەو جوولەكانە وەرنەگرت كە لەگەڵیدا جەنگان، چونكە ئەو كاتە ئایەتی جیزیە نەهاتبووە خوارێ، بەڵام كاتێك هاتە خوارێ، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) سەرانەی لە عەرەبە نەصرانییەكان و لەمەجووسییەكانیش، وەرگرت، وە ئەگەر ئەوكاتە هیچ كام لە بتپەرستەكانی عەرەب مابانەوە و، ئامادەبووبان سەرانە بدەن، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لێی وەردەگرتن، وەك چۆن سەرانەی لە خاچپەرستەكان و لە ئاگر پەرستەكان وەرگرت، وە ئەم قسەیە لە ڕووی بەڵگەوە بەهێزترە، وەك دەیبینین.

كەواتە: ئەوە كە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) سەرانەی لە عەرەبە بتپەرستەكان وەرنەگرتوە، لەبەرئەوە بووە كە ئەو كاتە كەسیان نەماوە لە نێو دورگەی عەرەبیی دا و هەموویان هاتوونە نێو ئیسلامەوە، ئنجا بە ڕاست یان بەدرۆ.

---

(١) ج٥ص٩٢،٩١.

**ئیشکالی سێیەم:** ئەو زانایانەی ڕایان وایە کە سەرانە لە هەموو جۆرەکانی کافران وەرناگیرێ، وە سەرەنجام هەموو جۆرەکانی کافران بۆیان نیە ببنە هاووڵاتیی لە دەوڵەتێکی ئیسلامییدا، لە وەڵامی فەرموودەکەی موسلیم دا کە بورەیدە لەبابییەوە هێناویەتی - کە پێشتر باسمان کرد - دەڵێن: فەرموودەکە پێش ئازادکردنی مەککە، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی، وە بە ئایەتی:

﴿... فَٱقْتُلُوا۟ ٱلْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدتُّمُوهُمْ ...﴾ التوبة -٥-. کە لە سووڕەتی (التوبة)دا هاتوە، نەسخکراوەتەوە، یاخود مەبەست لە وشەی (عدوك) کافرانی خاوەن کتێبە، هەرچەندە دەفەرموێ: ( عدوك من المشركين ) بەڵام چونکە خاوەن کتێبەکانیش، [واتە: جوولەکەو نەصرانییەکان] بە دەقی ئایەت غەیری خواش دەپەرستن:

﴿ وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ عُزَيْرٌ ٱبْنُ ٱللَّهِ وَقَالَتِ ٱلنَّصَـٰرَى ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ ٱللَّهِ... ﴾ التوبة -٣٠-.

کەواتە: ئەوانیش هاوبەشدانەرن.

**لە وەڵام دا دەڵێین:**

بێگومان فەرموودەکەی (بريدة) پاش هاتنە خواری ئایەتی جیزیە بووە و، ئەویش - واتە: ئایەتی سەرانە - دوای ئازادکردنی مەککە، هاتۆتەخوار، واتە: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) کاتێك فەرموویەتی: سەرانە لە موشریکەکان وەربگرن، کە ئایەتی سەرانە هاتۆتە خوار، وە بەتەئکید ئایەتی سەرانەش دوای ئازادکردنی مەککە دابەزیوە، چونکە ماقووڵ نیە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بەر لەهاتنە خواری ئایەتی سەرانە، باسی سەرانەوەرگرتن بکات! پاشان ئایەتی سەرانە، وە ئایەتی جەنگ کە دەفەرموێ:

﴿... فَٱقْتُلُوا۟ ٱلْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدتُّمُوهُمْ ...﴾ التوبة -٥-.

لەیەك سوورەت دا هاتوونە خوار، کە سوورەتی (التوبة)یە، کە ئەویش لەو بەشەی قورئانە کە لەکۆتایی تەمەنی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دا هاتۆتە خوار.

پاشان ناشگونجێ مەبەست لە: ( عدوك من المشركين ) بەس کافرانی خاوەن کتێب بن، چونکە وشەی: (مشرك) نازناوە بۆ کافرانی هاوبەش بۆخوادانەر و بتپەرست. وە ئەوانەی دیکە تەنیا وشەی ( أهل الكتاب) یاخود (أوتواالكتاب) یان بۆ بەکار هێنراوە، ئنجا وشەی (مشرك) با خاوەن کتێبەکانیش هاوبەش بۆخوادانەر بن، بەڵام ئەوە نازناوێك بووە، تەنیا بۆ ئەو کافرانەی کە خاوەن کتێب نەبوون و بتپەرست بوون، بەکار هێنراوە.

کەواتە: ئێستا دوای ئەوەی کە ڕابرد دەڵێین: بۆمان ڕوون بووەوە کە ئەو ڕایە ڕاستتر و بەڵگەدارترە، کە دەڵێ:

سەرجەم جۆرەکانی کافران بۆیان هەیە ببنە هاووڵاتیی لە دەوڵەتی ئیسلامییدا، بەڵکو هەر ئەو ڕایە ڕاستە و، ئەگەر باش سەرنجی سەرجەم ئایەتەکانی قورئان بدەین، لەوبارەوە دڵنیا دەبین.

بەڵێ: پێویستە دەوڵەتێکی ئیسلامیی سینەی ئەوەندە فراوان و بەرین بێت، کە تێکڕای مرۆڤەکان بەسەر جەم نەتەوە و تیرە و ڕەنگ و زمان و ئایین مەزەب و ئایدۆلۆژیاکانیانەوە بگرێتە خۆی، واتە خاوەن کتێب بن، وەك: (جوولەکەو نەصرانییەکان، وە هەرکۆمەڵێکی دیکە کە ئیسپات بێ، کتێبی ئاسمانییان هەبووە) یان بێ کتێب بن، وەك هەموو جۆرەکانی دیکەی کافران، لە بتپەرست و مانگ و خۆر پەرست و چی و چی پەرست و، وە کافری ئاشکرابن، یان پەنهان (واتە: مونافیق بن) وەکافری ئەسڵیی بن، یاخود هەڵگەڕاوە (مرتد)، وەك پێشتریش بەدرێژی باسی مەسەلەی هەڵگەڕانەوە لە ئیسلاممان کرد، لەکاتی توێژینەوەی بنەماکانی سیستمی حوکمڕانیی ئیسلامیی دا [دابینکردنی ماف و ئازادییەکان].

بەڵێ پێویستە دەوڵەتی ئیسلامیی سێبەرەکەی هێندە پان و بەرین بێت و، سینگی هێندە فراوان بێ، کە هەموو جۆرەکانی کافران و تێکڕای مرۆڤەکان، خاوەنی هەر فیکرە و ئایدۆلۆژیایەك بن، بگرێتە خۆی و بتوانێت لە سایەی دا بحەوێنەوە و ژیانێکی ئازادانە کە شایستەی مرۆڤ بێت و، ژیانێکی سەربەرزانەی وا کە لە مرۆڤ و ڕێز و پێگەی ناوازەی بوەشێتەوە - کە جێنشینی خوایە -، ژیانێکی ئاوا بگوزەرێنن، وە نابێ ئەو دەوڵەتە ئیسلامییە، هیچ مەرجێکیشیان لەسەر دابنێ، بێجگە لەوە کە هاووڵاتییەکی بێ زەڕ و لاشەڕ و دڵسۆز و بەکەڵك بن، وەك خوا فەرموویەتی:

﴿ لَا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمْ يُقَٰتِلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوٓاْ إِلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴿٨﴾ ﴾ الممتحنة -٨-.

واتە: خوا لێتان قەدەغە ناکات کەسانێك کە لەسەر دینتان لەژتان نەجەنگاون و لە ماڵ و حاڵی خۆتان وەدەریان نەناون، کە لە گەڵیان دا چاکەکار و بەخشەر بن، بێگومان خوا بەخشەرانی خۆش دەوێت.

پێشتریش بەدرێژیی باسی ئەم ئایەتەمان کرد.

بەڵگەکانی ئەم قسەیەشم - کە پێشتریش باسم کردوون - بەڵام ئێستاش جارێکی دیکە پوختیان دەکەمەوە:

# چوار بەڵگەی سەرەکیی
# لەسەر ڕاستیی ڕای هەڵبژێرراو

**بەڵگەی یەکەم:** مادام خوا ژیانی دنیای کردوە بەشوێنی تاقیکرنەوەی مرۆڤ و جند، وەك دەفەرموێ:

﴿ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ...﴿٢﴾ ﴾ الملك -٢-.

واتە: ئەو خوایەی کە مردن و ژیانی گێڕاون، تاکو تاقییتان بکاتەوە، کامەتان کردەوەی باشترە.

وە مادام خوا مرۆڤی ئازاد و سەرپشك کردوە لە نێوان هەڵبژاردنی ئیمان و کوفروە لەنێوان سوپاسگوزاریی و سپڵەییدا، وەك دەفەرموێ:

﴿ وَقُلِ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ ۖ فَمَن شَآءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَآءَ فَلْيَكْفُرْ ﴾ الكهف -٢٩-.

واتە: بڵێ حەق لە پەروەردگارتانەوەیە، کێ حەز دەکات با ئیمان بێنێت و، کێ حەز دەکات با کافر بێت، هەروەها دەفەرموێ:

﴿ إِنَّا هَدَيْنَٰهُ ٱلسَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرًا وَإِمَّا كَفُورًا ﴿٣﴾ ﴾ الإنسان -٣-.

واتە: ئێمە ڕێمان پیشانداوە، [واتە: ڕێی ڕاست] ئنجا یان سوپاسگوزار دەبێ، یان سپڵە. کەواتە: دەبێ سەرجەم مرۆڤەکان بتوانن لەکۆمەڵگا و دەوڵەتی ئیسلامیی دا، ژیانێکی ئازادانەی شایستەی مرۆڤی ڕێزلێگیراو و، بەجێنشینی خوا دانرا و، بگوزەرێنن.

**بەڵگەی دووەم:** مادام خوای کاربەجێ ئایین و کتێب و پێغەمبەری کۆتایی خۆی بۆ تێکڕای بەشەر ناردوون، بە هەموو ڕەنگ و زمانەکانیانەوە، وەك دەفەرموێ:

﴿ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَالَمِينَ ﴿٢٧﴾ ﴾ (التكوير) -٢٧-.

واتە: ئەم قورئانە تەنیا یادخەرەوەیە بۆ تێکڕای جیهانییان، هەروەها دەربارەی پێغەمبەری کۆتایی (محمد) (صلى الله عليه وسلم) لە سوورەتی: (الأنبياء -١٠٧-دا فەرموویەتی:

﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَٰلَمِينَ ﴿١٠٧﴾ ﴾

واتە: تۆمان نەناردوە مەگەر بەزەیی بی بۆ تێکڕای جیهانییان.

وە مادام خوا ڕاشیگەیاندوە کە تۆبزیی کردن و زۆرلێکردن لە ئایین دانیە:

﴿ لَآ إِكْرَاهَ فِي ٱلدِّينِ... ﴾ البقرة -٢٥٦-.

واتە: تۆبزیی لێ کردن لە دین دا نیە.

هەروەها لە سوورەتی (یونس) -٩٩-دا دەفەرموێ:

﴿ وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ لَءَامَنَ مَن فِي ٱلْأَرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعًا ۚ أَفَأَنتَ تُكْرِهُ ٱلنَّاسَ حَتَّىٰ يَكُونُوا۟ مُؤْمِنِينَ ﴿٩٩﴾ ﴾

واتە: ئەگەر خوا ویستبای تێکڕای خەڵکی سەرزەوی ئیمانیان دەهێنا، ئایا تۆ زۆریان لێ دەکەی تاکو بیانکەیتە ئیماندار؟ واتە: مادام خوا بە خوایەتیی خۆی زۆری لێ نەکردوون، بە تۆبزیی بیانکاتە ئیماندار، ئەی موحەممەد! وە ئەی هەر کەسێکی دیکە! بە تەئکید تۆ چاکتر ئەوەت بۆ نیە.

**بەڵگەی سێیەم:** مادام هەرکەسێك لە ناخیدا و بەقەناعەت و بە دڵ ئیمان نەهێنێ و مسوڵمان نەبێ، ناگونجێ بە زۆر بهێنرێتە نێو ئیسلامەوە، چونکە ئیمان پێوەندیی بە عەقڵ و دڵەوە هەیە، بە دەقی ئایەت:

﴿ ...كَتَبَ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلْإِيمَٰنَ ... ﴾ المجادلە-٢٢-.

﴿ ...وَلَمَّا يَدْخُلِ ٱلْإِيمَٰنُ فِى قُلُوبِكُمْ ... ﴾ الحجرات-١٤-.

کەواتە: کەسێك بە دڵ ئیمان نەهێنێ، نابێتە ئیماندار، بەڵکو دەبێتە مسوڵمانێکی ڕووکەش و ڕواڵەتیی و دووڕوو، واتە: دەبێتە کافرێکی پەنهان، کە لە زاراوەی شەرع دا مونافیقی پێ دەگوترێ، وە مونافیقیش لە کافری ڕواڵەتیی و ئاشکرا بە زەرەرترە و، سزاشی سەختترە، وەك خوا دەفەرموێ:

﴿ إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ فِى ٱلدَّرْكِ ٱلْأَسْفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ وَلَن تَجِدَ لَهُمْ نَصِيرًا ﴿١٤٥﴾ ﴾ النساء-١٤٥-.

واتە: بێگومان مونافیقەکان لە پلەی هەرە ژێرەوەی ئاگردان، وە هیچ یارمەتیدەرێکت بۆ ئەوان چنگ ناکەوێ، کە دیارە ئەگەر ئەو ئینسانە بە کافرێکی ئاشکرا بمێنێتەوە، لە دوو ڕووانەوە چاکترە:

١- ناشەرعیی لەگەڵ نەکراوە، کە زۆری لێبکرێ وبکرێتە مسوڵمان، چونکە زۆر کردن لە خەڵك کە بکرێنە مسوڵمان، ناڕەوایە وەك خوا فەرموویەتی:

﴿ لَآ إِكْرَاهَ فِى ٱلدِّينِ... ﴾ البقرة -٢٥٦-.

﴿ ...أَفَأَنتَ تُكْرِهُ ٱلنَّاسَ حَتَّىٰ يَكُونُوا۟ مُؤْمِنِينَ ﴿٩٩﴾ ﴾ یونس -٩٩-.

﴿ ... وَمَآ أَنتَ عَلَيْهِم بِجَبَّارٍ ... ﴾ ق -٤٥-.

﴿ لَّسْتَ عَلَيْهِم بِمُصَيْطِرٍ ﴿٢٢﴾ ﴾ الغاشية -٢٢-.

مانای وایە پێچەوانەی ئەو ئایەتانە ڕەفتارە لەگەڵ نەکراوە، کە بە کافرێکی ئاشکرا ماوەتەوە.

٢- کوفرەکەی کە کوفرێکی ئاشکرایە، بۆخۆیشی سزای کەمترە لە قیامەت دا، وە بۆ مسوڵمانانیش زیانی کەمترە لە دنیادا، چونکە ئایەتەکە دەفەرموێ:

موونافیقەکان لە پلەی ژێرەوەی ئاگردان، مانای وایە سزایان لەهی کافرانی دیکە قورسترە، وە کافرانی مونافیق لە دنیاش دا بۆ مسوڵمانان بەزەڕترن و، وەك مار وان و بە پەنهانیی پێوە دەدەن، کافری ئاشکرا دەیبینی، بەڵام مونافیق خۆی لە بەرگی مسوڵمان دا دەنوێنێ و، وەك پێشینان دەڵێن: ( گورگە و لە پێستی مەڕ دایە).

کەواتە: هیچ سوود و کەڵکێکی تێدا نیە، کە خەڵك ناچار بکرێ خۆی بە مسوڵمان پیشان بدات و، لە دڵیشدا مسوڵمان نەبێت و ئیمانی لە دڵدا نەبێت.

**بەڵگەی چوارەم:** پاشان مادام خوای بەرز و مەزن و کاربەجێ ڕایگەیاندوە کە حەتمەن بەشێك لە مرۆڤەکان کافر و بەشێکیشیان ئیماندار دەبن:

﴿ هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَكُمْ فَمِنكُمْ كَافِرٌ وَمِنكُم مُّؤْمِنٌ ۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٢﴾ ﴾ التغابن-٢-.

واتە: خوا ئێوەی دروست کردوە، هەندێکتان کافرن و هەندێکتان ئیماندارن، وە خوا بینەری ئەوەیە کە دەیکەن.

بەڵێ لەبەر هەموو ئەوانە و لەبەر گەلێك هۆکاری دیکەش، کە لە ڕابردوودا باسمان کردوون، ناگونجێ دەوڵەتی ئیسلامیی سینە و سێبەری هێندە فراوان و پان نەبێت کە بەڕێز و حورمەت لێگرتنەوە و، بە ماف و ئازادیی دابینکردنەوە، جێگا و ڕێگای سەرجەم ئەو مرۆڤانەی تێدا نەبێتەوە، کە حەز دەکەن وەك هاووڵاتییەك لە ژێر سایەی دەوڵەتیی ئیسلامییدا بژین.

لە کۆتایی ئەم مەسەلەیەشدا دەڵێم: بێگومان لە حاڵێك دا کە دەوڵەتی ئیسلامیی ئەهلی کوفر سەرپشك دەکات، لە نێوان مسوڵمان بوونی ڕووکەشیی و کوژران (الإسلام الظاهري والقتل)دا - وەك هەندێك لە زانایان بە داخەوە ڕایان وابووە - کاتێك دەوڵەتی ئیسلامیی بەخەڵك دەڵێ: وەرن! یان دەبێ مسوڵمان بن، با بەدڵیشتان نەبێ، بەڕوو کەشیی مسوڵمان بن، یان دەتانکوژین! ئەوە ئەو دەوڵەتە ئیسلامییە ڕێگای لەو مرۆڤانە گرتوە، ئەو ئیمتیحانە بدەن کە

خوای پەروەردگار لێی داوا کردوون، چونکە خوای کاربەجێ ئینسانی بۆ ئەوە خوڵقاندوە، تاقی بکاتەوە و تاقیکردنەوەکەش ئەوەیە کە بواری هەبێت بە کەیفی خۆی وەڵامی پرسیارەکان بداتەوە، وەك لە سوورەتی (هود) -٧- دا دەفەرموێ:

﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ وَكَانَ عَرْشُهُۥ عَلَى ٱلْمَآءِ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ... ﴿٧﴾ ﴾

واتە: خوا ئاسمانەکان و زەوی لە شەش ڕۆژان دا [واتە: بەشەش قۆناغ] دروستکردوون، وە ئەو کاتە بارەگاکەی لەسەر ئاو بوو، تاکو تاقیتان بکاتەوە کامەتان کردەوەی باشترە...

بەم بەڵگانە بۆمان دەردەکەوێ کە مەسەلەی حەوانەوە و جێبوونەوەی سەرجەم نامسوڵمانانێك، کە حەز دەکەن هاووڵاتیی دڵسۆز و بێ زەڕی کۆمەڵگا و دەوڵەتی ئیسلامیی بن و، لەسایەیان دا بژین، مەسەلەیەکی یەکجار ڕیشەدار و قووڵە و پەیوەستە بە کۆی بووناسیی (ئۆنتۆلۆجیی) و ئیمان و عەقیدەی ئیسلامییەوە.

هەڵبەتە کە لێرەدا بەگشتی باسی نامسوڵمانانمان کردوە مەبەستمان هەموو جۆرەکانییانە، بەهەر پێنج بەشە سەرەکییەکانیانەوە:

١- بێدینان (الملاحدة).

٢- خاوەن کتێبان (أهل الكتاب).

٣- هاوبەشدانەران (المشركون).

٤- هەڵگەڕاوان (المرتدون).

٥- دەغەڵان ((المنافقون).

شایانی باسیشە کە ئێمە بەرگی هەشتەمی: (الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله)مان بەناوونیشانی (الإسلام نظرة سديدة تجاه الناس وتعامل صحيح معهم) تەرخان کردوە بۆ ڕوونکردنەوەی چۆنیەتی تێڕوانین و مامەڵەکردنی ئیسلام ومسوڵمانان، لەگەڵ نامسوڵمانان دا.

هەروەها لەکتێبی: (چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم)یش دا - چاپی شەشەم - تیشکی باش خراوەتە سەر ئەو بابەتە.

بەنسبەت بێدینان (ملاحدة) و هەڵگەڕاوان (مرتدین)یشەوە، کە بۆیان هەیە هاووڵاتیی دەوڵەتی ئیسلامیی بن - وێڕای بەڵگە گشتییەکان - دەتوانین ئەم دوو دەقە یەیەڵگە بهێنینەوە کە لەدوو سەرچاوە پێشووە ئامارە پێکراوەکەش داهێناومانن:

١- (روى سعيد بن منصور في سننه: ٢٥٨٨، أنَّ (تُسْتُرْ) فُتِحَت صلحاً، ثم كفر أهلها فغزاهم المهاجرون وَسَبُوهم، فأَمَر عُمَرُ بن الخطاب من سُبِيَ منهم، أن يُرَدوا الى جزيتهم، وفرَّق بين سادتهم).

٢- (روى عبدالرزاق في (المصنَّف:١٨٧١٤) أن قوماً أسلموا (من أهلالجزيرة بالعراق) ثم لم يَمْكُثوا الاّ قليلاً، فكتب فيهم ميمون بن مهران الى عمر بن عبدالعزيز، فكتب الله عمر: أنْ رُدَّ عليهم جِزيتَهم ودَعْهُم).

کەواتە: هەڵگەڕاوانیش بۆیان هەیەهاووڵاتیی دەوڵەتی ئیسلامیی بن!



ئێستاش لە کۆتایی ئەم تەوەرەیەدا، بە چاکی دەزانم سەرنجێکی خێرا لە مافەکانی نامسوڵمانان بدەین لە دەوڵەتی ئیسلامییدا، بە ڕیزبەندیی و چاوپێدا خشاندنێکی خێرا، هەرچەندە ئەوەی کە لە ڕابردوودا باس کرا، ئێمە بێ ئیحتیاج دەکات لەوەی کە جارێکی دیکە سەرژمێری ئەو مافانە بکەین، کە لە دەوڵەتی ئیسلامییدا بۆ نامسوڵمانان دابین دەکرێن، بەڵام بۆ زیاتر بەرچاو ڕوونکردنەوە، لێرەش دا بەخێرایی سەرژمێریان دەکەینەوە:

ئنجا من ئەو مافانەی کە لە دەوڵەتی ئیسلامییدا بۆ نامسوڵمانان دابین دەکرێن، کردوومن بە سێ جۆر:

یەکەم: مافە کەسیی و تایبەتییەکان.

دووەم: مافە فیکرییەکان.

سێیەم: مافە سیاسییەکان.



## یەکەم:

# مافە کەسیی و تایبەتییەکان

### ١- مافی ژیان و هێمنیی و ئاساییش:

هەموو ئینسانێك کە لە دەوڵەتی ئیسلامییدا و لە کۆمەڵگای ئیسلامییدا دەژی، پێویستە مافی ژیانی بۆ دابین بکرێ و، بە هێمنیی ئاساییش بژی و پارێزراو و سەلامەت بێت لە هەموو ڕووەیەکەوە، بەم بەڵگانەی خوارێ:

أ- لە سوورەتی (المائدة) -٤٥-دا خوای پەروەردگار دەفەرمویٚ:

﴿ وَكَتَبْنَا عَلَيْهِمْ فِيهَآ أَنَّ ٱلنَّفْسَ بِٱلنَّفْسِ وَٱلْعَيْنَ بِٱلْعَيْنِ وَٱلْأَنفَ بِٱلْأَنفِ وَٱلْأُذُنَ بِٱلْأُذُنِ وَٱلسِّنَّ بِٱلسِّنِّ وَٱلْجُرُوحَ قِصَاصٌ ... ﴿٤٥﴾ ﴾.

واتە: وە لە سەرمان نوسیبوون لە تەوڕات دا، کە نەفس بە نەفسە، چاو بە چاوە، لووت بە لووتە، گویٚ بەگوێیە، ددان بە ددانە، وە برینەکانیش تۆڵەیان لەسەرە...، کەواتە: ئەمە یاسایەکی گشتییە و هەرکەسێك هاووڵاتیی دەوڵەتی ئیسلامیی بێت پێویستە نەفسی پارێزراو بێ و هەر کەسێك بیکوژێ، دەکوژرێتەوە، چاوی کوێر بکات، چاوی کوێر دەکرێتەوە، زیان بەلووتی بگەیەنێ، بەگوێی بگەیەنێ، بەددانی بگەیەنێ، برینی تیٚ بکات، پێویستە تۆڵەی لیٚ بستێنرێتەوە.

ب- وە لە سوورەتی ( البقرة ) -١٧٩-دا، خوای دادگەر دەفەرمویٚ:

﴿ وَلَكُمْ فِى ٱلْقِصَاصِ حَيَوٰةٌ يَـٰٓأُو۟لِى ٱلْأَلْبَـٰبِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿١٧٩﴾ ﴾

واتە: وە لە تۆڵەدا ژیان هەیە بۆ ئێوە، ئەی خاوەن عەقڵینە! بۆئەوەی خۆتان بپارێزن.

کەواتە: تولّە کردنەوە، لە هەموو ئەو کەسانەی زیان دەگەیەنن بە هاووڵاتییانی ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامیی، بنچینەیەکی گشتییە.

ج- هەروەها لە فەرمووودەیەکی دیکەدا کە هەر (أبو داود) هێناویەتی، دەفەرموێ:

{"أَلاَ مَنْ ظَلَمَ مُعَاهِدًا أَوِ انْتَقَصَهُ أَوْ كَلَّفَهُ فَوْقَ طَاقَتِهِ أَوْ أَخَذَ مِنْهُ شَيْئًا بِغَيْرِ طِيبِ نَفْسٍ فَأَنَا حَجِيجُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ"} (رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ برقم: (٣٠٥٢)، وَالبَيْهَقِيُّ برقم: (١٨٥١١)).

واتە: هەر کەسێك ستەم لە پەیمان لە گەڵ دا بەستراوێك بکات، یاخود مافێکی لێ زەوت بکات، یاخود ئەرکێکی پێ بسپێرێ لە توانای خۆی زیاد بێت، یاخود شتێکی لێ وەربگرێ، بێ ئەوەی کە بۆ خۆی پێی خۆش بێت، ئەوە من لە ڕۆژی قیامەت دا بۆ دادگایی دەچمە بەرانبەری.

د- هەروەها پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە فەرمووودەیەکدا کە (بخاري) هێناویەتی، دەفەرموێ:

(من قَتَلَ مُعاهَداً لم يرح رائحة الجَنَّةِ، وإِنَّ رِيحَها لَيوجَدُ من مسيرَةِ أربعينَ عاماً)

واتە: هەرکەسێك هاوپەیمانێك [واتە: هاووڵاتییەکی نامسوڵمان لە دەوڵەتی ئیسلامییدا] بکوژێت، بۆنی بەهەشت ناکات، هەرچەندە بۆنەکەشی چل ساڵ ڕێ دەڕوات.

هـ- (حکیم بن هشام) پیاوێکی بینی کە سەرپەرشتیاری شاری (حمص) بوو، هەندێك لە خەڵکی ئەهلی کیتابی لەبەر خۆر ڕاگرتبوو، لەسەر ئەوە کە سەرانەیان نەدابوو، ئەویش گوتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو فەرمووی:

{إِنَّ اللَّهَ يُعَذِّبُ الَّذِينَ يُعَذِّبُونَ النَّاسَ فِي الدُّنْيَا} (رَوَاهُ أَحْمَد برقم: (١٥٣٦٦)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٦١٣)، وَالنَّسَائِيُّ في الكبرى برقم: (٨٧٧١)، وَالطَّبَرَانِيُّ برقم: (٤٣٧)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٣٠٤٥)).

واتە: بێگومان خوا ئازاری ئەو کەسانە دەدات کە ئازاری خەڵك دەدەن لە دنیادا.

**٢- مافی نیشتەجێ بوون و هاتن وچوون:**

ئەمیش ئەم دەقە دەیگرێتەوە: {لَهُمْ مَا لِلْمُسْلِمِينَ وَعَلَيْهِمْ مَا عَلَى الْمُسْلِمِينَ}[1] (رَوَاهُ أَحْمَد برقم: (١٣٣٧٢)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٣٨٥)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٢٦٤١)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٦٠٨)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٣٩٦٧)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٥٨٩٥)) واتە: ئەوان (نامسوڵمانان) هەمان مافیان هەیە کە ئێمە هەمانە، وە ئەوان هەمان ئەرکیان لەسەرشانە کە ئێمە لەسەرشانمانە.

زانایانی ئیسلام لەسەر ئەو بنچینەیە ڕێککەوتوون بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ خاوەن کتێبەکان (هاوپەیمانەکان) کە لە دەوڵەتی ئیسلامییدا دەژین، وەك هاووڵاتیی، دیارە جگە لەوەی کە بەبەڵگەیەکی شەرعیی جیاکرابێتەوە.

**٣- مافی کار و کاسبیی و دابینکردنی پێداویستییەکانی ژیان و گوزەران:**

ئەمیش چەندان ئایەت و فەرمایشتی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەیگەیەنن، کە پێویستە هەموو مرۆڤەکان کە لە دەوڵەتی ئیسلامییدا دەژین، بواری کارو کاسبیی یان بۆ برەخسێنرێ و، پێداویستییە سەرەتاییەکانی ژیانیان بۆ دابین بکرێن. وەك خوا لە سوورەتی (البقرة) -٢٩-دا دەفەرموێ:

﴿... خَلَقَ لَكُم مَّا فِي ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا ... ﴿٢٩﴾﴾

واتە: وە هەرچی لە زەویدا هەیە، بۆ ئێوەم خوڵقاندوە، ئەی مرۆڤەکان! کەواتە: کەس لە کەسی زیاتری بەش بەناز و نیعمەتەکانی خواوە نیە.

---

(١)ئەمە بەشێکە لە فەرمایشتێکی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) کە بەمجۆرە هاتوە: ( ..لأنِّي أعطيتهم عهد الله على أنَّهم ما للمسلمين، وعليهم ما على المسلمين، وعلى المسلمين ما عليهم بالعهد الذي آستوجبوا حق الذِّمام والذَّبِّ عنالحرمة، وآستوجبوا أن يُذَبَّ عنهم كل مكروه، حتى يكونوا للمسلمين شركاء فيما لهم وفيما عليهم..) بڕوانە: (مجموعة الوثائق السياسية للعهد النبوي والخلافة الراشدة) محمد حميدالله، ص ١٨٨، ط٨، رقم الوثيقة: ٩٧، (نسختان لمكتوب النبي (صلى الله عليه وسلم) الى نحران).

وە لە سوورەتی (الرحمن ) -١٠-دا، خوا دەفەرموێ:

﴿ وَٱلْأَرْضَ وَضَعَهَا لِلْأَنَامِ ﴿١٠﴾ ﴾

واتە: خوا زەوی بۆ خەڵك داناوە، نەیفەرمووە: خەڵكی مسوڵمان، یان خەڵكی كافر و نامسوڵمان! بەڵكو هەموو مرۆڤەكان، وەك یەك بەشیان بەو نازو نیعمەتانەوە هەیە، كە خوای پەروەردگار لە زەویدا دایناون.

وە هەر كەسە و بە قەدەر كۆشش و هەوڵی خۆی، بۆی هەیە بەری ڕەنجی شانی خۆی بخوات.

هەروەها لە كتێبی ( الخراج )دا هاتوە كە خالیدی كوڕی وەلید پەیمانی لەگەڵ كۆمەڵێك لە خاوەن كتێبەكاندا، بەست كە لە ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامیدا دەژیان، بەمشێوەیە: ( وجعلتُ لهم أيُّما شيخٍ ضَعُف عن العمل أو أصابته آفةٌ من الآفاتِ أو كانَ غنياً فآفتقَرَ وصارَ أهل دينه يتَصَّدقونَ عليهِ، طُرِحَتْ جِزيَتهُ و عيلَ من بيتِ مالِ المسلمين، هوَ وعِيالَهُ)[1].

واتە: وە ئەو مافەیان هەیە كە هەركامێك لەوانە بە تەمەن بوو، یان نەیتوانی كار بكات، یاخود دەردێكی تووش بوو لە دەردان، یاخود پێشتر دەوڵەمەندبوو، بەڵام هەژار كەوتبوو، بەشێوەیەك كە ئەهلی دینەكەی خۆی هاوكارییان دەكرد، دەبێ سەرانەكەی لەسەر لابچێت، وە پێویستە لە خەزێنەی دەوڵەتی ئیسلامیی خۆی و خێزانەكەی (یان ئەوانەی كە نەفەقەیان لەسەریەتی) مەسرەفیان بكێشرێ.

ئەمەش بنچینەیەك بووە كە هەموو ئەوانەی لە دەوڵەتی ئیسلامیی دا ژیاون، ئەگەر نەیانتوانی بێ خۆیان بژیەنن، لەسەر دەوڵەتی ئیسلامیی پێویستبووە، مووچەیان بۆ ببڕێتەوە و ژیانیان دابین بكات.

---

(١) ص ١٥٥، ١٥٦.

## دووەم:

## مافە فیکرییەکان

**١- مافی دەربڕینی بیرو ڕا:**

خوای بەرز و مەزن دەفەرموێ:

﴿ لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ... ﴾ البقرة -٢٥٦-.

واتە: تۆبزیی کردن نیە لە ئایین دا، کەواتە: هەرکەسە ئازادە، چ عەقیدە و فیکرەیەکی هەیە و، چ دینێك هەڵدەبژێرێ.

وە لە سوورەتی (یونس)دا خوا فەرموویەتی:

﴿ ...أَفَأَنتَ تُكۡرِهُ ٱلنَّاسَ حَتَّىٰ يَكُونُواْ مُؤۡمِنِينَ ٩٩ ﴾ يونس -٩٩-.

واتە: ئایا تۆ زۆر لە خەڵك دەکەی تابیانکەیتە ئیماندار؟! یانی: بۆت نیە زۆریان لێ بکەی.

هەروەها لە سوورەتی (الكهف )یش -٢٩-دا دەفەرموێ:

﴿ وَقُلِ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكُمۡۖ فَمَن شَآءَ فَلۡيُؤۡمِن وَمَن شَآءَ فَلۡيَكۡفُرۡۚ ﴾ الكهف -٢٩-.

واتە: بڵێ: حەق لە پەروەردگارتانەوەیە، کێ حەز دەکات با ئیمان بێنێت و کێش حەزدەکات با کافر بێ.

مانای وایە بابای نامسوڵمان بۆی هەیە کوفری خۆی دەربڕێ و عەقیدە و بیر و ڕای خۆی ڕابگەیەنێ.

**٢- مافی وتاردان و نووسین و سەرجەم چالاكییە كلتورییەكان:**

خوا لە سوورەتی (العنكبوت)دا دەفەرمویٚ:

﴿وَلَا تُجَٰدِلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ إِلَّا بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ... ﴿٤٦﴾﴾ -٤٦-

واتە: وتوویژ لەگەڵ خاوەن كتێبەكان دا مەكەن، مەگەر بە باشترین شێوە، واتە: نامسوڵمانان بۆیان هەیە وتوویژ بكەن، بۆ ئەوەی دیفاع لە عەقیدەی خۆیان بكەن، خاوەن كتێبەكان و غەیری خاوەن كتبەكانیش.

هەروەها خوا لە سوورەتی (آل عمران)دا دەفەرمویٚ:

﴿قُلۡ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ تَعَالَوۡاْ إِلَىٰ كَلِمَةٖ سَوَآءِۭ بَيۡنَنَا وَبَيۡنَكُمۡ... ﴿٦٤﴾﴾ -٦٤-.

واتە: ئەی خاوەن كتێبەكان! وەرن بۆ وشەیەكی ڕاست كە بۆ ئێمە و ئێوە وەك یەكە.

هەروەها لە سوورەتی (البقرة)دا دەفەرمویٚ:

﴿... قُلۡ هَاتُواْ بُرۡهَٰنَكُمۡ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿١١١﴾﴾ -١١١-.

واتە: بڵێ بەڵگەتان بێنن ئەگەر ڕاست دەكەن.. كەواتە: كافرەكان بۆیان هەبووە كە بەڵگەی خۆیان بخەنە ڕوو و وتویژ بكەن لەگەڵ مسوڵمانان دا.

وە لە سوننەتی كردەیی پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) دا هەروابووە، كاتێك نەصرانییەكانی نەجران هاتن، چەند ڕۆژێك لە مزگەوتی پێغەمبەری خوا دا (صلى الله عليه وسلم) مانەوە و، لەگەڵ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دا موناقەشەیان كرد و دیفاعیان لە نەصرانییەتی خۆیان كرد، كە عیسا كوڕی خوایە و.. هتد، وە ئایەتەكانی سەرەتای سوورەتی: (آل عمران) هەموویان بەو بۆنەوە هاتنە خوارەوە .

وە ئەوە لە كۆتایی ڕۆژگاری پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دا بووە.

بەڵام بێگومان ئازادیی دەربڕینی بیرو ڕا، جیایە لە قسەگوتن بە مسوڵمانان و ناوزڕاندنی مسوڵمانان و جنێودان بە ئیسلام، ئەوە هەم لە مسوڵمانان قەدەغەیە بەرانبەر بە کافران، هەم لە کافرانیش قەدەغەیە بەرانبەر بە مسوڵمانان.

وەك خوای دادگەر فەرموویەتی:

﴿ وَإِن نَّكَثُوٓاْ أَيۡمَٰنَهُم مِّنۢ بَعۡدِ عَهۡدِهِمۡ وَطَعَنُواْ فِي دِينِكُمۡ فَقَٰتِلُوٓاْ أَئِمَّةَ ٱلۡكُفۡرِ إِنَّهُمۡ لَآ أَيۡمَٰنَ لَهُمۡ لَعَلَّهُمۡ يَنتَهُونَ ١٢ ﴾ التوبة -١٢-.

واتە: وە ئەگەر پەیمانەکانی خۆیان هەڵوەشاندنەوە، دوای ئەوەی کە پەیمانیان بەستبوو، وە تانەیان لە دینی ئێوە دا، ئەوە لەدژی سەرکردەکانی کوفر بجەنگن، چونکە ئەوانە خاوەن پەیمان نین، بەڵکو واز بێنن.

هەروەها خوای بێ وێنە لە سوورەتی (الأنعام) دا دەفەرمویٚ:

﴿ وَلَا تَسُبُّواْ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ فَيَسُبُّواْ ٱللَّهَ عَدۡوَۢا بِغَيۡرِ عِلۡمٍ ١٠٨ ﴾.

واتە: وە جنێو بەوانە مەدەن کە لە جیاتی خوا دەیانپەرستن، تاکو ئەوانیش بە نەزانیی جنێو بە خوا نەدەن.

کەواتە: جنێو گوتن و قسەگوتن بە پیرۆزییەکانی یەکدی، شتێکە لە مسوڵمانانیش قەدەغە کراوە و لە نامسوڵمانانیش قەدەغەکراوە، بەڵام وتووێژی ئازادانە، ڕەوایە و هەرکەسە بابەڵگەی خۆی بێنیٚ، وەك خوای پەروەردگار پێیان دەفەرمویٚ:

﴿ ... قُلۡ هَاتُواْ بُرۡهَٰنَكُمۡ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ١١١ ﴾ -١١١-.

واتە: بلیٚ بەڵگەتان بێنن ئەگەر ڕاست دەکەن، کە دیارە کاتێك کەسێك بەڵگە دێنێتەوە دەگونجیٚ لە کۆڕێك دا بیهێنێتەوە، وە دەگونجیٚ لە کتێبێك دا بیهێنێتەوە، یان لە هۆیەکی ڕاگەیاندن دا، وەك تەلەفزیۆن یان ڕادیۆ.

**٣- ئازادیی فێرکردن و فێربوون:**

وەك چۆن مسوڵمانان بۆیان هەیە فێربن و منداڵەکانیان فێری ئایینی خۆیان بکەن، نامسوڵمانانیش بۆیان هەیە، وەك لە صەحیفەی پێغەمبەری خوا (صلى الله علیه وسلم) دا هاتوە: (للیَهودِ دینهم وللمسلمینَ دینهُم) جوولەکە ئایینی خۆیان هەیە، وە مسوڵمانانیش ئایینی خۆیان هەیە، یانی: هەرکامێکیان بۆی هەیە ئایینی خۆی مومارەسە بکات، دیارە ئەوەش کاتێك دەبێت کە بۆیان هەبێ ئایینی خۆیان فێری خەڵکی خۆیان بکەن و، ڕوونی بکەنەوە و ڕەواجی پێ بدەن.

وە لە سووڕەتی (الکافرون)یش دا، خوا دەفەرمویَ:

﴿ لَكُمۡ دِينُكُمۡ وَلِيَ دِينِ ۝٦ ﴾ -٦-.

واتە: ئایینی خۆتان بۆ خۆتان، وە ئایینی خۆم بۆ خۆم، مانای وایە ئەوە مافێکی هاوبەشە بۆ هەموو لایەك.

## سێیەم:

## مافە سیاسییەکان

**١- مافی هاووڵاتێتیی ( حَقُّ المواطَنَة ):**

(**الكاساني**) لە کتێبی: (بدائع الصنائع)دا گوتوویەتی: (والذمِّيُّ من أهلِ دارِ الإسلام)[1] واتە: وە هاوپەیمانان (نامسوڵمانانێك كە پەیمانیان لەگەڵ دەوڵەتی ئیسلامیی دا هەیە)، لە ئەهلی مەنزڵگای ئیسلامن، بەزاراوەی ئەمڕۆ: هاووڵاتیین لە دەوڵەتی ئیسلامییدا.

(**السنهوري**) لە کتێبی (فقه الخِلافة وتطوُّرُها)دا، بۆمان ڕوون دەكاتەوە كە (المواطنة) هاووڵاتیی بوون، چییە؟ دەڵێ: ( المواطَنَةُ مِعيارٌ سياسيٌ وليسَ معياراً عقَدياً ) واتە: هاووڵاتێتیی پێوەرێکی سیاسییە و پێوەرێکی عەقیدەیی نیە، واتە: مەرج نیە تەنیا كەسانێك هاووڵاتیی بن، كە لە عەقیدەدا لەگەڵت پێكدەگەنەوە، بەڵكو پێوەرێکی سیاسییە و، ئەم ڕستە قورئانییەش بەڵگەیەكی زۆر ئاشكرایە لەو بارەوە:

﴿...وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَمۡ يُهَاجِرُواْ مَا لَكُم مِّن وَلَٰيَتِهِم مِّن شَيۡءٍ...﴾ الأنفال -٧٢-.

واتە: وە ئەوانەی ئیمانیان هێناوە، بەڵام كۆچیان نەكردوە [بۆ دەوڵەتی ئیسلامیی]، ئێوە هیچ پەیوەندییتان پێیانەوە نیە، واتە: ئەوانە هاووڵاتیی نین، ئێوە لەسەرتان پێویست نیە كە بەرگرییان لێ بكەن و لە سەریان بكەنەوە، چونكە نەبوونەتە هاووڵاتیی، بەڵێ نامسوڵمانانێك كە لە دەوڵەتی ئیسلامییدان، دەبێ بەرگرییان

---

(١) ج٥ص٤٨١.

لێ بکەی، بەڵام مسوڵمانێك کە لە دەرەوەی دەوڵەتی ئیسلامییدایە، دەوڵەت مولزەم نیە کە بەرگریی لێ بکات، مەگەر لەسەر ئایین دەستدرێژیی بکرێتە سەر، ئەویش بەمەرجێك لە لایەن هێزو لایەنێکەوە نەبێت، کە لەگەڵ دەوڵەتی ئیسلامییدا هاوپەیمانە، وەك لەدرێژەی ئایەتەکەدا هاتوە.

ج- ئنجا ئایا بناغەی هاووڵاتیی بوون چییە؟ (الدكتور فتحى الدرينى) لە کتێبی: (خصائص التشريع الإسلامى فى السياسه والحكم)دا[1]، گوتوویەتی: (وإنَّ أَساسَ المواطَنَةِ: الولاءُ للدولَة) واتە: وە بناغەی هاووڵاتێتیی، بریتیە لەسەر بەدەوڵەت بوون.

کەواتە: نامسوڵمانێك کە سەر بە دەوڵەتی ئیسلامییە، وە پشتگیریی دەوڵەتی ئیسلامیی دەکات و، سوود بەدەوڵەتی ئیسلامیی دەگەیەنێت، ئەوە مانای وایە هاووڵاتییەکی تەواو عیاری دەوڵەتی ئیسلامییە.

### ٢- مافی بە ئەستۆوە گرتنی ئەرکە گشتییەکان (حقُّ تَولِّي الوظائفُ العامة):

کە پێشتر بە تەفصیلْ باسمان کرد و، لێرەدا پێویست ناکات دووبارەی بکەینەوە، گوتمان: جگە لەو ئەرکانەی کە بەبەڵگەیەکی ڕوون و بێ چەند و چوونی شەرعیی تایبەت کراون بە مسوڵمانانەوە، وەك کەسی یەکەمی دەوڵەتی ئیسلامیی و، کەسی یەکەمی دەستەڵاتی یاسادانان و، دەستەڵاتی جێبەجێکردن و، دەستەڵاتی دادوەریی، وە فەرماندەیی سوپا، جگە لەو پلەو پایە و پۆستانە، کە بەبەڵگەیەکی شەرعیی تایبەتکراون بە مسوڵمانانەوە، نامسوڵمانان بۆیان هەیە، هەر ئەرك و کارێك لە دەوڵەتی ئیسلامییدا بە ئەستۆوە بگرن، هەڵبەتە هەندێك ئەرکیش هەن کە تایبەت کراون بە نامسوڵمانانەوە و سروشتی ئایینەکەیان دەیانخوازێ، چ ئەهلی کیتاب، چ غەیری ئەهلی کیتاب، ئەوەش دیسان جگە لە خۆیان، دروست نیە کەسی دیکە ئەو ئەرکانە بەئەستۆوە بگرێ.

---

(١) ص٨٤،٨٣.

(دكتور يوسف القرضاوي) لە كتێبی: (غير المسلمين فى المجتمع الإسلامي)[1] دا، گوتوویەتی: [وقَد تَوَلَّى الوِزارَةَ في زَمَنِ العباسيين بعضُ النصارى أكثَرَ من مَرَّةٍ، منهم نصربن هارون سَنَة (٣٦٩)هـ وعيسى بن نسطورس سَنَة (٣٨٠)هـ] واتە: لە سەردەمی عەبباسییەکان دا، هەندێك لە نەصرانییەکان، زیاتر لە جارێك بوونە وەزیر، یەکێك لەوانە (نەصرِی کوڕی هارٍوون) لە ساڵی (٣٦٩)ی کۆچیی دا، وەزیر بووە لە دەوڵەتی عەبباسییدا، وەیەکێکی دیکە عیسای کوڕی نەستۆرس لە ساڵی (٣٨٠)ی کۆچیی دا وەزیر بووە. هەڵبەتە زانایانی ئیسلامیش هەبوون و کەسیان نەیگوتوە: دروست نیە، کەواتە: بۆیان هەیە ببنە وەزیر، وە پێشتریش باسمان کرد، کە وەك نوێنەری خەڵکەکەی خۆیان بۆیان هەیە لە ئەنجوومەنی نوێنەران (پەرلەمان)یش دا ئەندام بن، هەروەها ئەرك و کارەکانی دیکەیش، مادام مۆرکێکی ئیسلامییان نەبێت و، ئیسلامیی بوونی دەوڵەت ئیسلامی نەیانخوازێت و، تایبەتیان نەکات بە مسوڵمانانەوە، نامسوڵمانان و مسوڵمانان لەبەرانبەر ئەو جۆرە پۆست و پێگانەدا یەکسانن.

### ٣- مافی کۆبوونە و پێکهێنانی ڕێکخراوی مەدەنیی و سیاسیی:

ئەمیش پێویستە مافێکی سەلمێنراو و دانپێداهێنراو بێ بۆ هەموو هاووڵاتییان کە لەدەوڵەتی ئیسلامییدا دەژین و، بۆیان هەبێ کۆببنەوە و کۆڕ ببەستن و، خۆپێشاندان بکەن، وە ڕێخراوی مەدەنیی و ڕێکخراوی سیاسیی و حیزبیی پێك بێنن، چونکە مادام خوا دەفەرمووێ:

﴿ ... فَمَن شَآءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَآءَ فَلْيَكْفُرْ ﴾ الكهف -٢٩-.

کێ حەزدەکات با ئیمان بێنێ، وەکێ حەزدەکات با کافر بێ.

ئنجا ئەوەی کافر دەبێ، چ بە تەنیا کافر بێ، یان لەگەڵ خەڵکەکەی خۆی کافر بێ، خوای دادگەر ئەو مافەی پێداوە کە کافر بێ و، هیچ

---

(١) ص٢٤.

بەڵگەیەکیشمان نیە کە بڵێ: با کافر بێ، بەڵام دەبێ پرژوبڵاو بن!! پاشان لە سەردەمی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)دا، جوولەکەکان ڕێکخستنی ئیداریی و سیاسیی تایبەتی خۆیانیان هەبووە.

ئنجا ئەگەر تەماشای سیرە و ژیانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بکەین، دەبینین نامسوڵمانان لە دەوڵەتی ئیسلامییدا [جوولەکەکان نەصرانییەکان] حاڵەتێکی فیدراڵیی و کۆنفیدراڵییان هەبووە و، لەناوچەی خۆیان دا سەربەخۆبوون و بەرپرسانیان لە خۆیان بوون، وە ئیتیفاقیان هەبووە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیه وسلم) کە بەبێ ئیجازەی خۆیان، کەسێك نەچێتە سنووری قەڵەمڕەوی حوکمڕانیی ئەوانەوە، وەك پێشتر باسمان کرد.

هەڵبەتە ئەوەی کە لێرەدا بە مەرج گیراوە، لە مافە سیاسییەکاندا، هەر ئەوەیە کە دڵسۆز بن بۆ دەوڵەتی ئیسلامیی و، کودەتاچیی نەبن، وە سەربە هێز و قەوارەی دیکەی دەرەوەی دەوڵەتی ئیسلامیی نەبن، واتە: تابووری پێنجەم نەبن و، دڵسۆز بن و هاووڵاتییەکی بەکەڵك بن، ئەوکاتە هەموو ئەو مافانەی کە مسوڵمانان لێیان بەهرەمەندن، ئەوانیش لێیان بەهرەمەندن، جگە لەو شتانەی کە ئیسلامیی بوونی دەوڵەتی ئیسلامیی دەیانخوازێت، هەروەك ئەوانیش لە بەرانبەر دا، ئەو ئەرکانەی کە نەصرانیی بوونیان، یان جوولەکە بوونیان، یان صابیئە بوونیان، یان بودایی بوونیان یان .. هتد، دەیانخوازێ، ئەو ئەرك و پۆستانە تایبەت دەبن بە خۆیانەوە.

لێرەش دا دێینە کۆتایی ئەم تەوەری چوارەم و کۆتاییەی بابەتی فراوانی ئیسلام و دەوڵەتداریی، دیارە من دەزانم ئەم بابەتی ئیسلام و دەوڵەتدارییە، بابەتێکی زۆر گرنگ و گەورەیە و، ئێمە ڕەنگە نەمان توانیبێ، حەقی خۆیان بدەین بەهەموو ئەو مەسەلانەی کە باسمان کردن، بەڵام بەرهەرحاڵ دوای ئەوەی زۆر تەماشای کتێب و سەرچاوەکانم کردوە و، زۆر سەرنجی قورئان و سوننەتم داوە و، عەقڵی خۆم خستۆتە کار، گەیشتوومەتە ئەو قەناعەتانەی کە خستمنە

ڕوو، کە بەم شێوەیە ئیسلام تەماشای حوکمڕانیی و دەوڵەتداریی و بەڕێوەبردنی کۆمەڵگا دەکات.

لە خوای پەروەردگار داواکارم ئەگەر ئەوەی کە تێیدا پێکاومە، پاداشتم بداتەوە، وە ئەوەیش کە نەمپێکاوە بەبەزەیی خۆی لە هەڵە و کەم و کوڕییەکانمان ببووریێ، بێگومان تەنیا کتێبی خوا و فەرمایشتی پێغەمبەری خوایش، لە هەڵە و کەم و کوڕیی دوورن و، ئێمە هەمووومان قسەشمان لێوەردەگیرێ ئەگەر ڕاست بێت، وە بەسەریشماندا دەدرێتەوە، مادام هەڵە بێت و، تەنیا پێغەمبەران (علیهم الصلاە والسلام) لە هەڵە پارێزراون.

سبحانك اللهم وبحمدك، أشهد أن لا إله الا أنتَ أستغفرك وأتوب اليك

١٤٣٧/٥/٥ك

٢٠١٦/٠٢/١٤ز

# بەرهەمەکانی دانەر

**کە بەپێی ڕیزبەندیی نووسرانیان، ڕیزکراون:**

١- پوختەیەك دەربارەی ئیسلام. چاپی ٢/ ٢٠٠٦.

٢- دەبەرێك ڕاچوونی ئیسلام و ڕێچکان. چاپی ٣/ ٢٠٠٦

٣- یادی خوا، گرنگی یادی خوا لە ژیانی مرۆڤ دا. چاپی ١ /١٩٨٧

٤- کۆمەڵی خوا. چاپی ١ / ١٩٨٨

٥- پێشمەرگەی ئیسلام، یان مسوڵمانی موجاهید کێیە وچۆنە؟ چاپی٣ /٢٠٠١

٦- دەردو دەرمانی بزووتنەوەی ئیسلامیی. چاپی ١ /١٩٨٩

٧- ڕێگای صاڵح بوون و بەرەو خوا چوون. چاپی ٥ /٢٠١٢

تێبینی: وەرگێڕدراوە بۆ زمانی عەرەبی و فارسییش.

٨- کوردستان بۆ وێران بوو و چۆن ئاوەدان دەبێتەوە؟!. چاپی ١ / ١٩٨٩

٩- حوکمی گەڕانەوە ژێر نیری طاغووت. چاپی ٢ /٢٠٠٥

١٠- سۆزی نەتەوایەتی و بیری ناسیۆنالیزم لە تەرازووی ئیسلامدا. چاپی ٣ /٢٠٠٥

١١- چارەسەری کێشەی کورد لە نێوان ئیمان و پەرلەمان دا. چاپی ١ /١٩٩٢

١٢- بزووتنەوەی ئیسلامیی لە دووڕیانی مان و نەمان دا. چاپی ١ /١٩٩٣

١٣- بزووتنەوەی ئیسلامیی و ئایندەیەکی گەش و ڕوون. چاپی ١ / ١٩٩٥

١٤- پرۆژەی بەرنامەی فیکریی کاری ئیسلامیی. چاپی ١ / ١٩٩٦

١٥- چەند ڕێڕوونییەك بۆ ئیسلامییەکانی کوردستان. چاپی ١ /١٩٩٦

١٦- ئیسلام و کێشە هەنووکەییەکان. چاپی ١ /١٩٩٨

١٧- با وریا بین! داڕووخانی ڕەوشت کۆمەڵگاکەمان بەرەو هەڵدێر دەبات. چاپی ٢ /٢٠٠٧.

١٨- خواپەرستیی ئیسلامیی ١-٤، چاپی ٢٠٠٩/٢.

١٩- گەڕانەوە بۆ لای خوا "عز وجل". چاپی ٥ /٢٠١٠

٢٠- زانایانی ئیسلام کێن و چۆنن ؟!. چاپی ٣ / ٢٠١١

تێبینی : بۆ زمانی عەرەبیش وەرگێڕراوە.

٢١- بنچینە گرنگەکانی هەڵسوکەوتی شەرعییانەو ژیرانە لەگەڵ وردە بابەتە خیلافییەکاندا. چاپی ١ / ١٩٩٩ .

تێبینیی: ئەمە بەشێکە لەبەرگی یەکەمی کتێبی: (خوا پەرستیی ئیسلامیی).

تێبینی: بۆ زمانی عەرەبیش وەرگێڕراوە.

٢٢- مزگەوتەکانی کوردستان لەنێوان ئاوەدانکردنەوەو وێران کردن دا. چاپی ١ /٢٠٠٠

٢٣- تاقیکردنەوەی خوا بۆ بەندەکانی چی یەو چۆنە؟ چاپی ٢ /٢٠١٢.

٢٤- بنەما شەرعییەکان و هێڵە گشتییەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی. چاپی ٣ /٢٠١٣

تێبینی: وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبییش.

٢٥- کۆمەڵی ئیسلامیی: ئامانج و هەڵوێستەکانی. چاپی ١ /٢٠٠١

٢٦- بەشدارییکردن لە هەڵبژاردنی پەرلەماندا، هەڵسەنگاندنێکی شەرعییانەو ژیرانە، چاپی ٢٠١٠/١.

٢٧- ناوە هەرەپیرۆزەکانی خوا، چاپی ٢٠١٣/١.

تێبینیی: ئەمە بەشێکە لەبەرگی سێیەمی: (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی).

٢٨- ئافرەتی مسوڵمانی کورد مافە شەرعییەکانی و ئەرکە گرنگەکانی. چاپی ١ /٢٠٠٣.

٢٩- ئافرەت و خێزان لە سایەی شەریعەتدا، بەرگی ١و٢ چاپی ٣/ ٢٠١٣

٣٠- چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم. چاپی ٦ / ٢٠١٦

تێبینی: وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبیی و تورکیی و فارسییش.

٣١- چەند ڕێڕوونییەك بۆ خوشك و برایانمان لە هەندەران. چاپی ١ /٢٠٠٢

٣٢- سنوورە قەدەغەکان مەشکێنن! (چاوپێکەوتنی دکتۆرحسین محمد عزیز). چاپی ٢ / ٢٠٠٣

٣٣- چۆن هەڵسوکەوت لەگەڵ خەڵکی دا بکەین؟! چاپی ١ / ٢٠٠٢

تێبینی: وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی.

٣٤- شەهید کێیەو چ پلەوپایەیەکی هەیە ؟! چاپی ١ / ٢٠٠٢

٣٥- جیهاد لە ڕێی خواداو چەند سەرنجء ئاگادارییەك.چاپی ١/ ٢٠٠٢.

٣٦- بۆئەوەی لەسەر جیهادکردنمان قەرزدار نەبینەوە! چاپی ١ / ٢٠٠٢.

٣٧- جیهاد لە ڕێی خوادا چی یەو بۆچی دەکرێ و چۆن دەکرێ؟ چاپی ١/ ٢٠٠٢.

٣٨- خواناسیی، ئایین، ئیمان، چاپی ١/٢٠٠٢.

٣٩- ئەشکەنجەو زیندان (چاوپێکەوتنی هاوژین عومەر) چاپی ٣/ ٢٠٠٩ .

تێبینی: وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبیی، هەروەها دوو تەرجەمەی فارسیشی کراون و چاپ و بڵاوکراوەتەوە، هەروەها بۆ زمانی ئینگلیزییش وەرگێڕراوەو چاوەڕێی چاپە.

٤٠- کارو پرۆژەی ئیسلامییمان (وتاری کۆنگرەی یەکەمی کۆمەڵی ئیسلامیی) چاپی ٢ / ٢٠٠٦.

٤١- ئیسلام و مسوڵمانەتیی و کاری ئیسلامیی، لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا. چاپی ١ / ٢٠٠٦ .

٤٢- ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی ١-٦، چاپی ٢٠٠٦/١-٢٠٠٨.

٤٣- تەوژمی ئیسلامیی و عەلمانیی و خاڵە هاوبەش و جیاوازەکانیان، چاپی ٢٠١٥/٣.

تێبینی: زۆربەی بە (٢٤) ئاڵقــە لە هەفتەنـامەی (هـاووڵاتیی)و ئەوەی دیکەش بە (٩) ئاڵقە لە هەفتەنامەی (ئاوێنە)دا بڵاوکراوەتەوە.

٤٤- گەنجەکانمان لە نێوان ڕەسەنایەتیی و لاسایی کردنەوەدا، چاپی ١/ ٢٠٠٦.

٤٥- بە دوورخستنەوەی ئافرەت لە ئیسلام چ زیانێك دەکەین؟، چاپی ٢٠٠٧/١.

٤٦- سیاسەتی ئیسلامیی و چەند ڕوونکردنەوەیەك، چاپی ٢٠٠٧/١.

٤٧- چۆنیەتی بوونە پێشەنگ و بنیاتنانی بنکەی جەماوەریی، چاپی ٢٠٠٧/١.

٤٨- چەند بنەمایەکی گرنگی وتاربێژیی، چاپی ٢٠٠٦/١.

٤٩- قوتابیانی زانیاری شەرعیی و چەند سەرنج و ڕێنماییەك، چاپی ٢٠٠٧/١.

٥٠- خوو ڕەوشتی بەرزو پەسند سەنگی مەحەکی مسوڵمانەتییە، چاپی ٢٠٠٧/١.

٥١- بانگەواز بۆ لای خوا، چاپی ٢٠٠٧/١.

٥٢- قوتابییان لەم هەل و مەرجەدا، پێویستە چۆن بن و چی بکەن؟!، چاپی ٢٠٠٨/١.

٥٣- واقیعی هەرێمی کوردستان، دیدێکی ئیسلامییانە، چاپی ١/ ٢٠٠٨.

٥٤- سروشت و پایەکانی خێزان و مەسەلەی چەندژنیی لە تەرازووی شەرع و عەقڵدا، چاپی ٢٠٠٩/١.

٥٥- وتاری کۆنگرەی دووەمی کۆمەڵی ئیسلامیی (ڕاپۆرتی ئیمانیی و سیاسیی کۆمەڵی ئیسلامیی) چاپی ٢٠١٠/١.

٥٦- چەند بابەتێکی هونەریی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا، چاپی ٢٠١٥/٢.

تێبینیی: بۆ زمانی فارسییش تەرجەمە کراوە.

٥٧- با لەخزمەت قورئاندابین، چاپی ٢٠١٦/٢.

تێبینیی: ئەم کتێبە کۆی هەردووك کتێبی: (چۆن باشتر لەقورئان بەهرەمەند دەبین؟) و (ئەرکی سەرشانمان بەرانبەر بەقورئان)ە.

تێبینی: ئەم نامیلکەیە بە(١٤) ئاڵقە لە ڕۆژنامەی (ڕۆژنامە)دا بڵاوکراوەتەوە.

٥٨- پوختەی ژیاننامەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، چاپی ٢٠١٢/٣.

٥٩- چەند بابەتێکی سیاسی هاوچەرخ لەبەر ڕۆشنایی عەقڵ و وەحییدا، چاپی ٢٠١٠/١.

٦٠- کاری ئیسلامیی و ڕەواندنەوەی چەند تەم ومژێك، چاپی ٢٠١١/١.

٦١- حوکمی لە ئیسلام هەڵگەڕانەوەو هەڵسەنگاندنێك، چاپی ٢٠١١/١.

٦٢- مەلای گەورە کۆیەو تەفسیرەکەی و چەند سەرنجێك، چاپی ٢٠١١/١.

٦٣- جەژن و یادو بۆنەو جەژنەکان و هەڵسەنگاندنێك، چاپی ٢٠١٢/١.

٦٤- خاتوون مەلاژن ئافرەتێکی هەڵکەوتوو و هاوسەرێکی ناوازە، چاپی ٢٠١٢/١.

تێبینیی: ئەمە بەشی نۆیەمە لەکتێبی: (ئافرەت و خێزان لەسایەی شەرعیەتدا).

٦٥- ڕەوەندی کورد لە هەندەرانء ئەرکی سەرشانی، چاپی ٢٠١٢/١.

٦٦- ڕوونکردنەوەی بنەما شەرعییەکان و هێڵە گشتییەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی، چاپی ٢٠١٤/٣.

٦٧- چەند بنەمایەکی گرنگی ماڵ و سامان بەخشین لەڕێی خوادا، چاپی ٢٠١٣/١.

تێبینیی: ئەمە لەبەرگی یەکەمی: (تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز) وەرگیراوە.

٦٨- ئیسلام و دەوڵەتداریی: ١-٤، چاپی ٢٠١٤/١-٢٠١٦.

٦٩- تەرجەمەی عەقیدەی طەحاویی، چاپی ٢٠١٤/١.

٧٠- تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی یەکەم: سوورەتەکانی: (الفاتحة) و (البقرة)، چاپی ٢٠١٢/١.

٧١- تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی دووەم، سوورەتی: (آل عمران)، چاپی ٢٠١٢/١.

٧٢- تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی سێیەم: سوورەتی: (النساء)، چاپی ٢٠١٣/١.

٧٣- تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی چوارەم: سوورەتی: (المائدە)، چاپی ٢٠١٤/١.

٧٤- تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی پێنجەم: سوورەتی: (الأنعام)، چاپی ٢٠١٥/١.

٧٥- ڕوونکردنەوەی عەقیدەی طەحاویی، چاپی یەکەم/٢٠١٥.

٧٦- گیانی ژیان، چاپی ٢٠١٥/١.

٧٧- چەند مەڵۆیەك لەخەرمانی تەمەنم، چاپی ٢٠١٥/١.

٧٨- هەڵوەشاندنەوەی بیروڕاو ڕەفتارە پەڕگیرانەکانی ڕێکخراوی (داعش)، چاپی ٢٠١٥/١.

٧٩- با هەڵو لادانی پەڕگیران، بەرانبەر بەئیسلام نەمانخاتە دوودڵیی و گومان، چاپی ٢٠١٥/١.

٨٠- پەڕگیریی: هۆکارەکانی، شوێنەوارەکانی، چارەسەری، چاپی ٢٠١٦/١.

٨١- سوننەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەنێوان تێپەڕاندن و بەزایەداندا، چاپی ٢٠١٦/١.

٨٢- بینینی خوای بەرزو مەزن لەدنیاو دوارۆژدا، چاپی ٢٠١٦/١.

**کتێبە عەرەبییەکان:**

مەوسووعەی: (الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله)

کە لەچاپی یەکەمدا (٨) بەرگەو، لەچاپی دووەمیدا لە (١٢) کتێبدا دەبێ، بەم شێوەیە:

٨٣- الكتاب الأول: الإسلام: معرفة صحيحة بالخالق والخلق.

٨٤- الكتاب الثاني: تعريف الإيمان.

٨٥- الكتاب الثالث: الإيمان بالله تعالى: الخالق الرب المالك الإله...

٨٦- الكتاب الرابع: الإيمان بالملائكة وبالجن.

٨٧- الكتاب الخامس: الإيمان بكتب الله الحكيم.

٨٨- الكتاب السادس: القرآن العظيم.

٨٩- الكتاب السابع: الإيمان برسل الله وأنبيائه الكرام، «عليهم السلام»

٩٠- الكتاب الثامن: خاتم النبيين محمد «صلى الله عليه وسلم»: موجز سيرته وبراهين نبوَّته.

٩١- الكتاب التاسع: إهتداء الإنسان بهدى الله، أو الإلتزام الفردي بشريعة الله.

٩٢- الكتاب العاشر: إلتزام المجتمع بشريعة الله تعالى.

٩٣- الكتاب الحادي عشر: معالم الدولة في الإسلام.

٩٤- الكتاب الثاني عشر: الإسلام نظرة سديدة تجاه الناس وتعامل صحيح معهم.

٩٥- نقض فكرة التطرف. ط٢٠١٦.

٩٦- ضيف و قضية (مقابلة مع قنــاة العربية)، ط١/٢٠٠٦.

٩٧- حوار خاص (مقابلة مع قناة العالم)، ط١/٢٠٠٦.

**ئەو کتێبانەی لەژێر چاپن:**

٩٨- ڕەوشت و ئاکاری ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا.

٩٩- تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی شەشەم: سوورەتی: (الأعراف).

١٠٠- تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی حەوتەم: سوورەتی: (الأنفال).

١٠١- تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی هەشتەم: سوورەتی: (التوبة).

١٠٢- قورئان و چارەسەری واقیعی ئێستامان، چاپی ٢٠١٦/١.

# نێوەڕۆك

دووەم: هەروەها لەبەرانبەردا، نامسوڵمانانیش، جوولەكە و نەصڕانیی و ئەوانی دیكەش، هەموو ئەو ئەرك و كار و پێگانەی كە بە تایبەتمەندیی و دروشم و نیشانەی ئەوان دادەنرێن، دیسان پێویستە قۆرخی خۆیان بن، وە مسوڵمانان

## ئەم كتێبە

بەهەرچوار تەوەرەكەیەوە لێكۆڵینەوەیەكی نەفەس درێژانەیە لەبارەی دەوڵەتداریی و حوكمرانییەوە لەئیسلامدا و، وەڵامی چەند پرسیارێكی گرنگی لەوبارەیەوە گرتۆتە خۆی:

١| ئایا ئیسلام بەسروشت دەوڵەت و قەوارەی سیاسیی دەخوازێ؟

٢| ئایا تایبەتمەندییەكانی قەوارەی سیاسیی لەئیسلامدا چی و چین؟

٣| ئایا بنەمایەكانی سیستەمی حوكمرانیی ئسلامیی چەندن و چۆنن؟

٤| ئایا سێ دەسەلاتەكانی: یاسادانان و جێبەجێكردن و دادوەریی لەئیسلامدا چۆنن و سنوورو صەلاحەتیان چییەو چۆنە؟

٥| ئایا نامسوڵمانان لە دەوڵەتی ئیسلامییدا چۆن تەماشایان دەكرێ و، چۆن مامەڵەیان لەگەڵدا دەكرێ؟

ئەمانەو گەلێك پرسیارو ئیشكالی دیكەش لەم كتێبەدا، وەلام دراونەتەوەو چارەسەر كراون.

ئیسلام و دەوڵەتداریی

علی باپیر

4

ISLAM AND TH




**نوسینگەی تەفسیر**

بۆ بڵاوكردنەوەو ڕاگەیاندن

هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر هوتێلی شیرین پالاس

+964 750 818 08 66

www.al-tafseer.com

tafseeroffice@yahoo.com

/TafseerOffice